تۆ لەوە گەورەتری کە بیری لێ دەکەیتەوە ؟

# هاتووینەتە ئەم دنیا بۆئەوەی بیگۆڕین

مەسعود لەعلی




وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی

گریمانەی هێز: کۆمەڵە چیرۆکێک لەبارەی کارتێکەر و کارتێکراو
لەم کتێبەدا ئاشنا دەبین بە سێ جۆر مرۆڤ: کارتێکراو، کارتێنەکراو، کاریگەر
**ئایا تۆ ئامادەیت ئەو ئاشە بەردە بیت کە ئاراستەی ڕووبارەکە بگۆڕیت؟**

تۆ گەورەتری لەوەی کە بیری لێدەکەیتەوە! ٩

# هاتووینەتە ئەم دنیا بۆ ئەوەی بیگۆڕین

نوسینی: مەسعود لعلی

وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی

چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٤٧٩)**

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: **هاتووینەتە ئەم دنیایە، بۆئەوەی بیگۆڕین**
- نوسینی: **مەسعود لەعلی**
- وەرگێڕانی: **بەرهەم ناودەشتی**
- بابەت: چیرۆکی کورت و پەندنامیر. رێ و رەمی ژیان
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢ ١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی : (١١٨٠)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

# نەفرەت ئاراستەی بەرد بکە

قوتابییە دڵشکاوەکە لەبەرانبەر زمانشڕییەکدا، بەپەلە بەرەو لای مامۆستا ڕۆیشت. مامۆستا کە ئەم دیمەنەی بینی داوای لە قوتابییەکەی کرد بچێتە دەرەوەی شار و سێ جار نەفرەت لە بەردە گەورەکەی کەناری کانییەکە بکات و هەرچی قسەی ناشیرینە بیستوویەتی ئاراستەی بەردەکەی بکات و بگەڕێتەوە.

قوتابییەکەش ئەمەی کرد. مامۆستا لێی پرسی: بەردەکە هیچ پەرچەکرداری بەرانبەر تۆ هەبوو؟ قوتابییەکە وتی: نەخێر، بۆچی؟ بەرد وەڵام دەداتەوە؟

مامۆستا وتی: نەڕەنجان و زویر نەبوون لە بەرد فێر بە، تۆش دەبێ بگەیتە ئاستێك کە لە زمانشڕیی دۆست و دوژمن نەڕەنجێیت.

هەموو ڕۆژێك بڕۆرە کەناری کانی، بەرانبەر بەردێك دانیشە و سەعاتێك تێرامان لەبارەی ئەوەی کە وتم ئەنجام بدە. ئینجا بە سێ جار وتنەوەی ئەو دەستەواژەیەی خوارەوە ڕاهێنانەکەت کۆتایی پێ بێنە:

**لەنێوان جوڵێنەر و وەڵامدا مەودایەك هەیە، و لەم مەودایەدا، ئازادی و مافی هەڵبژاردنی ئێمە لە هەڵبژاردنی ئەو وەڵامەدایە.**

سەرەتا بۆ تێگەیشتنی باشتر لە کاریگەربوون و کارتێکراوبوون، دەبێ ئەوە بزانین کە مرۆڤ وەکو زیندەوەرێك لەسێ بنچینە پێکهاتووە:

١-بنچینەی مەعریفەیی یان ئەقڵی (کە تێڕوانین و بیروباوەڕمان دەگرێتەوە).

٢-بنچینەی هەڵپە و خرۆش (کە سۆز و هەستەکان دەگرێتەوە).

٣-بنچینەی ڕەفتاری (پەیوەندی بە کردارەکانی مرۆڤەوە هەیە). لە ڕاستیدا ئەم سێ بنچینەیەن کە (بوون) یان (نەبوون)ی ئێمە پێکدێنن.

-رستەی (من سەرقاڵم) ئاماژەیە بە بیرکردنەوەی سەرقاڵانە و پیشاندەری حاڵەتێکی بوونمانە.

-رستەی (من تورەم) ئاماژەیە بە جۆرە حاڵەتێك یان بوونی خرۆش ئامێز.

-رستەی (من درۆزنم) ئاماژەیە بە کردار یان رەفتارێك.

لە راستیدا (من) (ئەوەی کە هەم) بەشێوەی:

١-تێروانین و بیروباوەڕ

٢-هەستەکان

٣-رەفتار

رەنگدەداتەوە.

ئێستا پرسیارێك کە دەبێ وەڵام بدرێتەوە ئەمەیە: ئایا ئەوەی کە هەم (بیر، هەست، رەفتار) سەرچاوەگرتووی هەڵبژاردنێکە کە بەشێوەی ئاگایانە و ئازادانە روویداوە یان سەرچاوەگرتووی ئەو هۆکارە دەرەکییانەیە کە هیچ دەستتێوەردانمان تیایدا نییە و بەشێوەی حیسابێکی (دەرەوەی ویستمان) بەسەرماندا دەسەپێنرێت.

**ئایا ئەوەی کە هەم یان تیایدام هەڵبژاردنێکە یان سەپێنراوێك؟**

مۆدێل و روانگەی کارتێنەکراوبوون وێڕای جەختکردنەوە لە بوون و هێزی کاریگەریی هەلومەرجی دەرەکی (مرۆڤەکانی تر و هەلومەرج) بانگەشەی ئەوە دەکات کە مرۆڤ بوونەوەرێکی بێ دەسەڵات، ناچار، دەستەوستان و پاشکۆی بێ چەندوچونی هەلومەرجی دەرەکی نییە. بگرە ئەو خاوەنی ئەم توانایەیە کە بە کەمبوونەوەی هێزی بزوێنەرە دەرەکییەکان (مەرج نییە بەشێوەیەکی رەها) وەکو بوونەوەرێکی هەڵبژێرەر و کاریگەر، هەڵبژاردن ئەنجام بدات.

## گوتاری کاریگەربوون

١-من ئەوە هەڵدەبژێریم کە چ بیروباوەڕێك بە ئەقڵمدا گوزەر بکات.

٢-من ئەوە هەڵدەبژێرم چ هەست و سۆزێکم هەبێت.

٣-من ئەوە هەڵدەبژێرم کە چ بڕیارێك بدەم و چ ڕەفتارێکم هەبێ.

**بە کورتی:** من ئەوە دیاری دەکەم کە چ کەسێك بم.

## گوتاری کارتێکران

١-من ناتووانم بیروباوەڕ و تێڕوانینەکانم دیاری بکەم.

٢-من ناتووانم هەستەکانم کۆنترۆڵ بکەم.

٣-من ناتووانم بەو شێوەیەی کە حەز دەکەم ڕەفتار بکەم.

بەکورتی: من ڕۆڵێکی چارەنووسسازم نییە لەوەی کە چ کەسێك بم.

**ئەدەبیاتی کارتێکران:**

**من کەسێك نیم کە دیاری بکات چ کەسێك بم.**

## دوو دنیا بوونیان هەیە

دەگێڕنەوە مەلا هادی سەوزەواری لە کۆتایی تەمەنیدا بەیتێك شیعری وت:

پاش تەمەنێك لە هەوڵ و بەدواداچوونی زانستی گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەرچی پێی گەیشتم لە دڵ و ویژدانمەوە بوو:

سەرم لەسەر دامێنی مەعشوق بوو کە خەوم پیا کەوت

دەستم لەسەر دڵم بوو کە بێدار بوومەوە

**سەرنج:** دوو واقیع و دوو دنیا بوونیان هەیە:

١-دنیا و راستی دەرەکی

٢-دنیا و راستی ناوەکی

ژینگەی ناوەکی (من) و ئەوەی کە هەین دەگرێتەوە:

توانایی، لەباردابوون، ئامادەیی، هێزی ئەفراندن و واقیعی دەرەکی ژینگەیەکە کە مرۆڤ تیایدایە و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. واتە **ئەو کەس و هەلومەرجە** دەگرێتەوە کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵدا هەیە.

## ناوەوە (مرۆڤ و شتەکانی) ئەولەویەتی هەیە

## نەك دەرەوە (هەلومەرجی دەورووبەر)

مرۆڤی کارا باوەڕی وایە کە ئەوەی (من) لێی سەرپشکە واتە ئەو شتەی کە هەم، گەورەترە لە هەموو ئەو هێز و بزوێنەرانەی کە لە دنیای دەرەوەدا هەیە. بە جۆرێك کە بە سوودوەرگرتن لە سەرچاوە دەروونییەکان، مرۆڤ دەتووانێت نەك تەنیا کارتێکراو و لەژێر کۆتی دەرەوەدا نەبێت بەڵکو هەنگاوێك زیاتر بنێت و وەکو هۆکاری کاریگەر بەسەر ژینگەی دەرەوەدا زاڵ بێت.

**ئەدەبیاتی کاریگەری دانان:**

**ئەوەی کە هەین گەورەترە لەوەی کە تیایداین.**

لەبەرانبەردا، کارتێکراوەکان، رەسەنایەتی و رۆڵێکی رەنگینتر و زیاتر بۆ دنیای دەرەوە دەبینن. ئەوان بڕوایان وایە مرۆڤ ئەوەندە ئازادی و ئیرادەی نییە کە کۆنترۆڵی چارەنووسی بگرێتە دەست و بەختەوەرییەکەی بخولقێنێت. ئێمە

بوونەوەری ناچارکراو و ملکەچی هۆکارە دەرەکییەکان، ئەزموونە رووخێنەرەکان، حساباتی جینی و غەریزەکان و هێزە دەروونییەکانی خۆمانین.

لەم گۆشەنیگایەوە بڕوابەخۆبوون واتە ئیمان بە هێزی سەرچاوەکان و شتە ناوەکییەکان کاتێك کە هۆکارە ژینگەییەکانی ئازادی و ئیرادەی ئێمە تەحەدامان دەکەن. کەسێك کە رووبەڕووی کەمی بڕوابەخۆبوونە خۆی بە بچوکتر و سوکتر لە ژینگەی دەرەکی دەبینێت و سەرەنجام هەستی بە قوربانیبوون دەکات.

# دراماى هەنارده و هاورده

بەشێوەیەکی گشتی هەموومان بە زاراوەکانی هەنارده و هاورده ئاشنایین. یەکێك لە بنچینەکانی هێزی ئابووریی ولاَتێك لەوەدایە کە زۆرتر لەوەی کە هاوردەی دەکات، بەرهەمی نەتەوەیی و هەناردەی هەبێت. کارتێکراوەکان لە دەرەوەڕا دەڕواننە ناوەوە. زۆرتر لەوەی کە دەرچوون (کاریگەری دانان)یان هەبێت، چوونەناوەوە (کارتێکران)یان هەیە. زۆرتر لەوەی کە بکەر بن، کارلەسەرکراون. زیاتر لەوەی کە دیاریکەر بن، دیاریکراون.

لەلایەکی ترەوە، کارتێکەرەکان لەناوەوەڕا دەڕواننە دەرەوە و لەبەرانبەر بزوێنەرەکانی ژینگەدا بوونەوەری کارلەسەرکراو و دەستەوستان نین و ڕێگەی هاتنەناو و کارتێکردنی کۆنترۆڵنەکراو نادەن. ئەوان خۆیان بە کەرەستەی چارەنووس دانانێن بەڵکو خۆیان بە بکەری گۆڕان هەژمار دەکەن.

لەم بەشەدا ئاماژە بە ژمارەیەك راستی و تایبەتمەندییەکانی کارتێکران دەکەم:

١- **کارتێکرانی جۆش و خرۆشانە:** بوونی هەستی نێگەتیڤ پێوەرێکی گرنگی کارتێکرانە. کاتێك حاڵمان خراپە واتە ملکەچی ژینگەیەکین کە تیایدا دەژین و ڕێگای پێدەدەین جڵەوی ڕۆحیەتمان بگرێتە دەست و کەموکوڕی لە شێوازی ژیانماندا بێنێتەکایەوە.

٢- **ڕەفتارە کاردانەوەییەکان:** جۆر کرداریشمان پێوەرێکی گرنگە لە ئاشکرابوونی ئەم راستییەدا کە لە ناوچەی هێزداین یان لەناوچەی لاوازیدا.

ڕەفتاری وەکو توندوتیژی و شەڕانگێزی، تۆڵە، لاساییکردنەوەی کوێرانە، ملکەچی بێ چەندوچون لە نەریتە نالۆژیکییەکان، بارودۆخی گۆڕاو و ناجێگیری ئێمە پیشان دەدەنەوە.

**٣-جۆرێکی تری کارتێکران:** کارتێکرانە بەهۆی غەریزەکان، ئارەزووەکان و حەزە نەفسانییەکان کە باسیان دەکەین.

**٤-کەمبوونی هەستکردن بە زەنگینی:** مرۆڤ تووشی کێشە بنەرەتییەکانی ڕەفتار و جۆش و خرۆش دەکات. بەتایبەت لە پەیوەندییە نێوان کەسییەکانماندا ناچارمان دەکات سۆراخی سەرنجڕاکێشان، ڕاکێشانی سۆزی منداڵانە، درۆ، ڕیا، هاوتابوون لەگەڵ کۆمەڵ، پەیڕەوی هێزی دەرەکی بکەین. لەم بەشەدا دەپرژێمە سەر ئەم پرسانە.

**٥-بڕوابەخۆبوون:** کەمیی بڕوابەخۆبوون تاکەکەس لە ڕووبەڕووبوونەوەی پرس و کێشەکانی ژیاندا دەستەوستان، لاواز و نائومێد دەکات و ڕێگەی پێ نادات ڕۆڵی کاریگەرانەی خۆی ببینێت. لەم بەشەدا بەکورتی دەپرژێمە سەر دوو تیۆرەی سەرچاوەی کۆنتڕۆڵ (جولیان ڕاتەر) و دەستەوستانی فێرکاری (مارتین سلیگمەن).

پاڵـەوان نییـە ئـەو کەسـی کـە لـە ململانێـدا پاڵەوانەکەی تر بەرداتەوە پاڵەوان ئـەو کەسـەیە کـە هەنـدێ جـار تـوڕەیی نەفسـی جەسـتەی دامرکێنێتەوە

# ئەلف: چیرۆکەکانی کەوتنە ژێر کاریگەریی جۆش و خرۆش
# ئەسپ لە رووباردا

لە مێژووی هێرۆدۆت هاتووە کە کوروشی پاشای ئێران و بونیادنەری زنجیرەی هەخامەنشی ئەسپێکی سپی جوانی هەبوو کە هەمیشە لە جەنگدا سواری ئەبوو.

لە بەهاری ساڵی ٥٣٩ ی پێش زاییندا، بە هیوای فراوانکردنی قەڵەمڕەوی خـۆی کوروش جەنگی لـەدژی ئاشـورییەکان راگەیانـد و بـە سـوپایەکی گـەورەوە بـەرەو (بابـل)ی پایتـەختی ئـەوان کەوتـەڕێ کـە کـەوتبووە کـەناری رووبـاری فـورات. بەرەوپێشچوونێکی باش بوو تـا ئـەوەی کە گەیشـتنە رووبـاری (گونـدس) کـە لـە شاخەکانی (متیانی)یەوە بەرەو دیجلە شۆڕ دەبووەوە. ئـەم رووبـارە تەنانـەت لـە هاوینیشدا مەترسیدار بوو.

فەرماندەکانی سوپا پێشنیاری ئەوەیان خستەڕووی کوروش کە پەلـە نـەکات، بەڵام کوروش نەترسا و فەرمانیدا دەستبەجێ لە گونـدس بپەڕنـەوە. بـەڵام کاتێـك کە بەلەمەکان ئامادە کران، ئەسـپی کـوروش، بـێ ئـەوەی کـە ئـەوانیتر تێبگـەن، هەوڵیدا بە مەلەکردن لە رووبارەکە بپەڕێتەوە. تەوژمی ئـاو گرتیـە خـۆی و بـەرەو خوارەوەی رووبارەکە بردی، ئەسپەکە نقوم بوو و خنکا.

کوروش تووڕە بوو. رووبارەکە بوێری ئەوەی هەبوو کە ئەسپە سپییە پیرۆزەکەی نغرۆ بکات، ئەسپی کەسێکی جەنگاوەر کە (کرویسوس)ی لەگەڵ زەوی یەکسان کردبوو و یۆنانییەکانی ترساندبوو. ئەو هاواری کرد و نەفرەتی نارد و لە ترۆپکی تووڕەییەکەیدا بڕیاریدا ئازایەتییەکەی گوندس سەرکوت بکات. کوروش سوێندی خوارد رووبارەکە وەها سزا بدات ئەوەندە لاواز ببێت کە لە ئایندەدا هەموو ژنێك بتوانێت بەبێ تەڕبوونی ئەژنۆی لێی بپەڕێتەوە.

کوروش پلانی فراوانکردنی ئیمپراتۆریەتەکەی بەلاوەنا. سوپاکەی خۆی کردە دوو بەش. ١٨٠ جۆگەلەی بچوکی دیاری کرد کە هەریەکەیان لە دوو لای رووبارەکەوە بە ئاراستەی جیاجیادا دەڕۆیشتن و فەرمانی بە سەربازەکانیدا تا دەستبکەن بە هەڵکەندن. ئەوان بەدرێژایی هاوین سەرقاڵی ئەم کارە بوون. رۆحیەتیان رووخابوو و هەموو هیوایان بۆ شکستپێهنانی خێرای ئاشوریەکان لەناوچووبوو.

کاتێ کارەکەیان تەواوبوو، گوندس کە رۆژێك لە رۆژان خێراترین رووبارەی ئەو ناوچەیە بوو بۆ ٣٦٠ جۆگەلە دابەش بوو و ئاو وەها بە خاوی پیایاندا دەڕۆیشت کە ژنان ناوچەکە بەبێ هەڵکردنی دامێنەکانیان بە ئاسانی دەیانتووانی پیایاندا بپەڕنەوە. تووڕەیی کوروش کەمبووەوە و فەرمانی بە سوپا ماندووەکەی کرد دەست بکەنەوە بە بەرەپێشچوون بەرەو بابل.

**سەرنج:** هەستەکان هۆکاری گرنگی پێکهاتنی جۆری رەفتارن. ئەوەی کە چ بڕیارێك ئەدەین، چۆن لەگەڵ ئەوانیتردا رەفتار دەکەین و چ کردارێك ئەنجام دەدەین پەیوەندی بەو پرسە گرنگەوە هەیە کە لەو ساتەدا رۆحیەت و حاڵەتی هەستیمان چۆنە.

ئـەم پەیوەسـتی و وابەسـتەییەی نێـوان هەسـت و ڕەفتـار، گرنگیـی بابـەتی بەڕێوەبردنی ڕۆحیەت پیشان دەدات، چونکە ئەگەر کۆنترۆڵی سۆزەکانی خۆمـان نەکـەین ئـەوا بەسـەر ڕەفتـاری خۆشمانـدا زاڵ نـابین و لەژیانـدا لـەبری کـردار، کاردانەوەمان دەبێت و ئەمەش واتە کارتێکران.

کارتێنەکراوەکان بڕوایان بە جۆرێك سەربەخۆیی سۆزی و ئۆتۆنۆمی هەسـتەکان هەیـە. ئـەوان بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە ئێمـە لـەژێر باڵادەسـتی هۆکـارە دەرەکییەکاندا نین. ژینگە زانیاریی خاو و بێ مانامان دەداتێ. گرنگ ئەوەیـە کـە مرۆڤ چۆن چۆنی دەپرژێتە سەر زانیاریی دەرەکی و لێکی دەداتەوە.

مـرۆڤ بەرپرسیهەسـت و حاڵـەتی ڕۆحییـە کـە لـە نـاوەوەدا ئـەزموونی دەکـات (بەرپرسیارێتی هەستی).

**نـەك ئـەوەی کـە بەسـەرمان دێـت بـەڵکو کاردانـەوەی ئێمـە بەرانبەری، ئازارمان دەدات.**

**(ستیڤن کۆڤی)**

**شێوازی ڕوونکردنەوە**

پرۆفیسۆر سەلیگمەن کە باوکی دەروونناسی گەشبینانەیە، کـەڵك لـە شـێوازی ڕوونکردنـەوەیی وەردەگرێـت بـۆ وەسـفکردنی دروسـتبوونی دڵـەڕاوکێ و حاڵەتـە جۆش و خرۆشە نێگەتیڤەکانی تر. ئەو بڕوای وایە هـەر کـە هـەر مرۆڤێـك خـاوەنی شێواز و مۆدێلێکە بـۆ دەستنیشـانکردن و ڕوونکردنـەوەی ڕووداوەکـان (بزوێنـەرە دەرەکییـــەکان). دڵـــەڕاوکێ و نائومێـــدی (کـــارتێکران) بەرهـــەمی تێـــڕوانین و هەڵسەنگاندنی نێگەتیڤە لە هەلومەرجەکان نـەك خـودی هەلومەرجـەکان. چـونکە

کەسانی دڵخۆش و زیندووش رووبەڕووی هەمان هەلومەرج دەبنەوە. بەڵام دووچاری دڵەڕاوکێی پایەدار و بەرەنگارانە نابنەوە. (ژیان بۆ ئەوانەی کە گەشبینن و بۆ ئەو کەسانەی کە لە رەشبینیدان، ناهەمواری و کێشەی هاوشێوە دێنێتەکایەوە، بەڵام گەشبینەکان رووبەڕووبوونەوەیەکی باشتریان لەگەڵ ناهەموارییەکاندا هەیە).

**(مارتین سەلیگمەن)**

وەرگێڕانی چەند رستەیەك لە زمانی کەوتنەژێر کاریگەری (خاڵی سەرەتا) بۆ زمانی کاریگەربوون (مەبەست):

| زمانی کاریگەربوون | زمانی کەوتنە ژێر کاریگەری |
|---|---|
| ئەوە هەڵبژاردنی من بوو رێگەمدا تا ئەقڵم تێکبدەیت | تۆ ئەقڵت تێکدام |
| لەبەرئەوەی نائومێد بووم مایەپوچ بووم | لەبەرئەوەی مایەپوچ بووم نائومێد بووم |
| ئەوە هەڵبژاردنی منە کە بچمە سینەما تا ئارام ببمەوە | لەگەڵ تۆدا نایەمە سینەما چونکە حەوسەلەم نییە |
| من رێگە نادەم بە رق هەڵگرتن لە تۆ، چێژ لە ژیان وەرنەگرم. | من رقم لە تۆیە ناتووانم بتبوورم |
| بەهای من پەیوەندی بە کرداری ئەوانیترەوە نییە. | من هەست بە پوچی دەکەم چونکە ئەو بێ رێزی بەرانبەر کردم |

شتێك کە ئەم دوو زمانە بەشێوەیەکی ئاشکرا لێك جیا دەکاتەوە کارتێکرانی سۆزییە کە کەسی کارتێنەکراو لە خۆی دەری دەخات. لەکاتێکدا کە تاکەکەسی

بەهێز ئاگای لە رۆڵ و بەرپرسیارێتییەکەیەتی لە بەرهەمهێنانی هەستەکاندا، تاکی کارتێکراو هەلومەرج و ئەو کەسانەی کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن بە هۆکاری پێکهاتنی هەستە نێگەتیڤەکان هەژمار دەکات و بە بەرپرسی حاڵی خۆی لەقەڵەمیان دەدات.

دەشێ قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی شەخسیی هەستە نێگەتیڤەکان، بمانخاتە ژێر فشارەوە، بەڵام گوزارشتە لەو خاڵە پۆزەتیڤەی کە من هەڵیدەبژێرم کە کۆنترۆڵکردنیان بگرمە دەست. لەبارێکدا کە کاتێك هۆکارە دەرەکییەکان بە کاریگەر دەبینین لە پێکهاتنی هەستەکانماندا لە راستیدا خۆمان لە شەڕی ژیاندا بێ چەك کردووە و هەموو جۆرە ئازای و دەسەلاتێکی جموجۆڵ بۆ رزگاربوون لە هۆکارە نێگەتیڤەکان لە خۆمان دەستێنین.

ژین لە ژێر فشاری گۆڕدا قورسە بیرەوەری
تۆزی قین لە لاپەڕەکە پاك بکەرەوە

# کارتێکرانی جۆش و خرۆشانە
# کۆلا زەکەی بابەك

بابەك حەوت ساڵانە و عاشقی یاری کۆلارەیە. ڕۆژێکیان عەسرەکەی وەکو هەمیشە کۆلارەکەی دەرهێنا و لە دەرەوەی ماڵەوەیان هەڵیدایە ئاسمان. کۆلارەکە ئەوەندە بەرز بووەوە کە چیتر نەدەبینرا.

ڕێبوارێك کە بەوێدا ڕەت دەبوو ئەوی بینی کە داوە بەنێکی لەدەستدایە. لێی پرسی:

—چی ئەکەیت؟

بابەك لە وەڵامدا وتی: کۆلارەم هەڵداوەتە ئاسمان.

ڕێبوارەکە کە هیچ کۆلارەیەکی نەدەبینی هەڵچوو. لێی پرسی: چۆن دەزانی کۆلارەکەت هێشتا لە ئاسمانە؟

بابەك: چونکە ئەتوانم هەست بەوە بکەم کە کۆلارەکە بەدوای خۆیدا رامدەکێشێت.

**سەرنج:** ئێوە کۆلارەی نەفرەتی چەند کەستان بەرەو ئاسمان ئاراستە کردووە و ئەوان بەدوای خۆیاندا راتاندەکێشن؟

بنەمای ژیانی مرۆڤ بەشێوەیەکە کە لەو کەسانە دوور دەکەوێتەوە و بەلایانەوە دەنێت کە نەیاری هەیە لەگەڵیاندا لەکاتێکدا کە پێی وایە لێیان دابڕاوە. بە

بیرهێنانــەوەی هەڵــە و کەموکوڕییــەکانی کەســە خراپــەکارەکان و گەشــەپێدانی هەستی نەفرەت و تورەیی ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات تا لـە ژیـانی دەروونیـدا هـەر بمێننەوە. هەرچەندە نایانبینێت بەڵام ئەوان بەردەوام ئەو بەلای خۆیانـدا بـەکێش دەکەن.

هەروەکو چۆن لە کتێبەکانی پێشوومدا وتوومە، ژنێك کە لە هاوسـەرەکەی جیـا دەبێتــەوە بــەڵام هــەموو ڕۆژێــك بــە بیرهاتنــەوەی ڕەفتــارە نالــەبارەکانی هاوسەرەکەی، خۆی نارەحەت و دڵتەنگ دەکات لە ڕاستیدا لە هاوسـەرەکەی جیـا نەبووەتــەوە و خــەریکی ژیــان بەســەربردنە لەگەڵیــدا. ڕق هــەڵگرتن واتــە کارتێکرابوون...ژیان لە سایەی کەسێکدا کە ڕقمان لێیەتی. واتە لـەژێر کاریگـەری کەسێکداین کە بە دوژمنی خۆمان لەقەڵەمی دەدەین.

بەخشـین بـەو مانایەیـە کـە لـەژێر سـایەی نفـوزی یـەکێکی تـر و شـوێنەواری کردارەکانی بچینە دەر. بەخشـین واتـە چـوونەتە قۆنـاغی دووەمـەوە. (قۆنـاغی یەکەم کەوتنەژێرکاریگەرییە، قۆناغی دووەم دەرچوونە لەژێر کاریگەری).

بەخشین کلیلی کاریگەری دانانە (کاریگەری دانان قۆناغی سـێیەمە). نـاکرێ بـە تۆڵە کاریگەری دابنێیت. تەنیا بە بەخشـینە کـە دەتوانیـت لەسـەر دوژمـنی خـۆت کاریگـەری دابنێیـت و بـە مەزنایـەتی خـۆت پەشـیمانی بکەیتـەوە و لـە پێگـەی کاریگەرێکدا بەرەو ڕۆحیەتی زاڵی خۆت بەکێشی بکەیت.

# کارتێکرانی جۆش و خرۆشانە: ئیرەیی بردن
## حیسامی حەسود

لە شارێکدا دوو پاڵەوان بە ناوەکانی رۆزبێ و حیسام دەژیان کە ساڵانێکی زۆر لە دۆستایەتی و ململانێدا لەگەڵ یەکتریدا دەژیان و مایەی شانازی شارەکەیان بوون. رۆژێکیان رۆزبێ بە مەبەستی پێشبڕکێ و ململانێ لەگەڵ پاڵەوانی شارەکە و رکابەرەکەی، سەفەری کرد و بە رێکەوت لە گەمەکەدا بردییەوە. هەواڵی سەرکەوتنە پڕشانازییەکەی بە خێرایی بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بووەوە. خەڵکی شار خۆشحاڵ بوون و مەراسیمێکی چڕوپڕی پێشوازیی بۆ رێکخرا.

بڕیار درا لە پاداشتی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەدا، لە گۆڕەپانی گەورەی شاردا پەیکەرێکی بۆ دروست بکرێت. هەر کە ئەم هەواڵە گەیشتە گوێی حیسام، پێی تووڕە بوو. هەستی ئیرەیی زۆر بزوا بوو. پرسیاری ئەوەی لە خۆی دەکرد بۆ دەبێ تەنیا پەیکەری رۆزبێ لە ناوەڕاستی شاردا دابنرێ. خراپترین چرکەساتی تەمەنی ئەوە بوو کە کاتێک بە گۆڕەپانی شاردا تێپەڕی پەیکەری رۆزبێی بینی. بەشێوەیەکی هەڵچووانە گەڕایەوە ماڵەوە و بڕیاریدا هەر ئەو شەوە بە تەورێك بکەوێتە وێزەی پەکەرەکە و بیڕوخێنێت.

سەر لەبەیانی کە خەڵکی بۆ کار و کاسبی لە ماڵ هاتنە دەرەوە، دیمەنێکی دڵتەزێنیان بینی. ئەوان سەیریانکرد کە لە گۆڕەپانی شاردا پەیکەری رۆزبێ بەسەر حیسامدا کەوتووە و بووەتەهۆی مردنی. بەڵێ، شەو کە حیسامی پاڵەوان

کەوتبووە وێزەی پەیکەرەکەی ڕۆزبێ، پەیکەرەکە بەسەریدا کەوتبووە خوارەوە و دەستبەجێ گیانی لەدەستدابوو...

سەرنج: ئیرەیی بردن یەکێکە لە تاڵترین حاڵەتە ڕۆحییە نێگەتیڤەکان کە هەموو کەسێکدا لە ژیاندا ئەزموونی دەکات.

کەسی حەسود بە هەڵچوون و گۆڕان بەرانبەر بارودۆخی ئەویتر لە ڕێگەی بەراوردکردنەوە لەگەڵ ئەوانیتر، هەستی نێگەتیڤی جیاوازی وەکو سوکایەتی، ئازار و خەم و قین لە خۆیدا گەشە پێدەدات.

خاڵی گرنگ لەبارەی ئیرەییەوە ئەوەیە کە هەرچەندە ئەم هەستە دەتوانێ بەشێوەی (ئیرەیی پۆزەتیڤ) سەرچاوەی پاڵنەر و ئیلهام بێت، بەشێوەیەك کە تاکەکەس بەرەو گۆڕانکاریی تاکەکەسی و بەرەوپێشچوون ببات لە ژیاندا، بەڵام لە حاڵەتی نەبوونی کۆنترۆڵندا تووڕەیی و کینە بەرهەم دێت. لەم قۆناغەدا کەسی حەسود دەبزوێنرێت و دەست دەداتە کرداری تێکدەری و ڕووبەڕووی ئەو سەرچاوەیە دەبێتەوە کە ئیرەییەکەی بزواندووە. لە ئەدەبیاتی مێژوویی-ئایینیدا نموونەی زۆری تاوان و کوشتنی سەرچاوەگرتوو لە ئیرەیی بەرچاو دەکەوێت.

لەو ڕۆژەوەی کە دەستی حەزرەتی قابیل
سوور بوو بە خوێنی حەزرەتی هابیل...
هەر لەو ڕۆژەوەی کە براکانی یوسفیان خستە بیرەوە
لەو ڕۆژەوەی کە بە قامچی و خوێن دیواری چینیان دروستکرد
مرۆڤایەتی مردبوو...

**(فەرەیدون مشیری)**

# کارتێکرانی جۆش و خرۆشانە: ترس
# تاقیکردنەوەی زاواکان

خاتوو مەلوك سێ کچی هەبوون کە هەرسێکیان هاوسەرگیرییان کردبوو. رۆژێکیان بڕیاریدا ئاستی پەیوەندییەکان لەگەڵ زاواکانیدا هەڵسەنگێنێت. یەکێك لە زاواکانی بۆ ماڵەوە بانگهێشت کرد و لەکاتێکدا کە لە لای حەوزەکەوە پیاسەیان دەکرد بە ئەنقەست وا پیشانیدا کە قاچی خلیسکا و خۆی خستە ناو حەوزەکە. زاواکەی دەستبەجێ خۆی خستە ناو ئاوەکە و رزگاری کرد.

سبەی بەیانی ئۆتۆمبێلێکی پیجۆ ۲۰٦ی نوێ لەبەردەم دەرگای ماڵی زاوا بوو کە لەسەر جامەکەی نوسرابوو: (سوپاست دەکەم! لەلایەن خەسوتەوە).

خاتوو مەلوك هەمان کاریشی لەگەڵ زاوای دووەکی کرد و ئەم جارەش زاواکە دەستبەجێ خۆی کرد بەناو ئاوەکەدا گیانی ژنەکەی رزگار کرد.

زاوای دووەمیش بۆ سبەینێ ئۆتۆمبێلێکی پیجۆی نوێی بە دیاری وەرگرت کە لەسەر جامەکەی نوسرابوو: (سوپاست دەکەم! لەلایەن خەسوتەوە).

نۆرەی زاوایەکی تر هات.

خاتوو مەلوك دیسان دیمەنەکەی دووبارە کردەوە و خۆی خستە ناو حەوزێکەوە، بەڵام زاواکە لە شوێنی خۆی نەجولا چونکە پێی وابوو کاتی ئەوە هاتووە ئەم پیرەژنە لە دنیا بڕوات کەواتە بۆچی من خۆم بخەمە مەترسییەوە؟

هەروا وەستا تاوەکو خەسوی لە ئاودا خنکا و مرد.

سبەی بەیانی ئۆتۆمبێلێکی بی.ئێم.دەبلیو دوایین مۆدێل لەبەردەم ماڵی زاوای سێیەم بوو کە لەسەر جامەکەی نوسرابوو: (سوپاست دەکەم! لەلایەن خەسوتەوە).

سەرنج: بەپێی تیۆرەی هێز، هەست و جۆش و خرۆشەکانی ئێمە وێنەدەرەوەی ئەو بارودۆخ و هەلومەرجەیە کە تیایداین.

لە راستیدا سۆز و رەفتارە جۆش و خرۆشییەکان پێمان دەڵێن لە کوێی پێگەی هێزداین.

(ترس) دایکی هەموو هەستە نێگەتیڤەکانە بەجۆرێك کە هەموو سۆزە نێگەتیڤەکانیتر، وەکو توڕەیی، شڵەژان، خەم، نائومێدی و قین لە ترسەوە سەرچاوە دەگرن یان دەتوانین بڵێین هەموو جۆش و خرۆشە نێگەتیڤەگان فۆرمێکی ترن لە هەستی ترس.

(توڕەیی ترسێکە کە حاڵەتێکی هێرشبەرانە دەگرێتە خۆی، دڵتەنگی و سترێس حاڵەتی بەرگریکاری و هەڵچوونی ترسە).

کاتێك کە ترس دەگاتە ئاست و پلەیەکی بەرز بەشێوەی نەفرەت، قین و دوژمنایەتی خۆی پیشان دەدات.

کاتێك لە کەسێك زویریت، کاتێك لەوانیتر توڕە دەبیت، و لە ئاستەکانی سەرووتردا کاتێك دەمانەوێ سەر بە جەستەی کەسەوە نەبێت و ئاواتەخوازی لێدان و دواجار مەرگی بین ئەوا لە خوارترین ئاستی هێزداین.

نەفرەت سەروەختێك سەرهەڵدەدات کە ئەبینین لەلایەن ئەوانیترەوە هەڕەشەمان لێدەکرێت یان ئەوەی کە لەلایەن ئەوانیترەوە زیانمان بەردەکەوێت. کاتێك زیانمان بەردەکەوێت، بەرژەوەندییەکانمان فەرامۆش دەکرێت و بۆمان

دەردەکەوێت کە بێ ڕێزیمان بەرانبەر کراوە و پشتگوێ خراوین، تووڕەیی و کینەمان تیادا سەر هەڵدەدات.

دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە هەندێ جار ئەو شتەی زیانمان لێدەدان سەرچاوەی دەرەکی (ڕەفتاری ئەوانیتر) نییە بەڵکو ڕاستییە ناوەکییەکان (لاوازییەکان و کەموکوڕییەکان لەناوەوە). ڕەگی نارەحەتی ئێمە نە لە ڕووداوەکان و هەلومەرجی دەرەکی بەڵکو لە ویستەکان و کێشە ناوەکییەکانی ئێمەدایە. هەلومەرجی دەرەوە تەنیا لاوازییەکانی ئێمە دەردەخات.

وایدابنێ پەنجەی تۆ زیانی پێگەیشتووە. ئێستا ئەگەر پەنجەی زیان پێگەیشتوو بەر هەر شتێك بکەوێت ئەوا هەست بە ئازار دەکەیت. لەکاتێکداەکە پەنجەی تۆ ساغ بوو، بەرکەوتن هەبوو، بەڵام تۆ هەستت بە نارەحەتی نەدەکرد. بەم شێوەیە هەموو ئەو ئازار و زەبرانەی کە بەر ئێمە دەکەوێت بەهۆی کێشەکان و ئەو بێ سەروبەریانەیە کە لە ناوماندا هەیە. بەڵام ئێمە غافڵین لەوەی کە ئەم واقیعە لەکاتی ئازارەکەدا تۆمەت ئاراستەی دەرەوەی خۆمان دەکەین و ئەوانیتر و هەلومەرجی دەرەکی بە بەرپرسی ئازار و ڕەنجی خۆمان لەقەڵەم دەدەین و دواتر هەستی ڕق و کینەمان بەرانبەر ئەوانیتر تیادا سەر هەڵدەدات و دواتر قین وەکو هەستێك، ڕەفتاری لێدەکەوێتەوە. واتە کینە ئێمە بەرەو توندوتیژی لەدژی سەرچاوەکان (ی دوژمن)، ئازار و هەڕەشەکەمان ئاراستە دەکات.

کینە ترسێکە کە شێوەی دوژمنایەتیشی گرتووەتە خۆی. ئەگەر لەوانیتر تووڕە و دڵ بە قینین بەو مانایەیە کە لە پێگەی لاوازیداین.

هێزی کارتێنەکراو جڵەونەکراو و بێ سنوورە. بە جۆرێك کە بە ئاسانی زەبری بەر ناکەوێت و لەبەرئەوەی خاڵی لاوازی نییە، زیان نابینێت و سەرەنجام هەستە نێگەتیڤەکانی وەکو تووڕەیی و قینیش ئەزموون ناکات. بەم پێیە ئێمە بە ڕادەی

هێزی خۆمان زەبرمان بەر دەکەوێت و سەرەنجام دەبینە جێگەی رق. چەندەی بەهێزتر بین کەمتر زیانمان بەر دەکەوێت و چەندەی کەمتر زیانمان بەر بکەوێت کەمتر تورە دەبین و بەرەو نەمان دەچین.

هەمیشە ئەو راستییە گەورەیەمان لەبیر بێت: ئەگەر کەسێك بە رەفتارەکەی زەبرمان پێ ئەگەیەنێت ئەگەر هاورێییەك بە قسەکانی بمانرەنجێنێت و دەبێە هۆی نارەحەتی و تورەییمان بەو مانایە نییە کە ئێمە لەبەردەم کەسێکی خاوەن کێشەداین، بەڵکو نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤێکی خاوەن کێشە و پێنەگەیشتوو لەناو ئێمەدا هەیە. لەکاتی تورەییدا قینی خۆمان لەوانیتر دەرنەکەین و پاشان هۆشیار بین:

ئەوانیتر بە رەفتارەکانیان زیانمان پێناگەیەنن ئەوان تەنیا پیشانمان دەدەن کە بە چ رادەیەك پێگەیشتووین و بەهێزین.

# ڕەفتارە پەرچەرکردارەکان: تۆڵە
# (پیرەمێردە دەوڵەمەندەکە و سێ منداڵەکەی)

پیرەمێردە دەوڵەمەندەکە هەموو دارایی خۆی بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان کوڕەکانیدا دابەش کرد. بەڵام ئەو ئەڵماسە گرانبەهایەی کە میراتی خێزانی بوو، لای خۆی هێشتەوە. ئەو سێ منداڵەکەی خۆی بە سەفەر نارد تا دنیا ببینێت و کاتی دیاریکر کە دوای گەڕانەوەی کوڕەکانی لە سەفەر، ئەڵماسە گرانبەهاکە بدرێتە کەسێك کە **ڕەفتارەکەی شەرەفمەندانە بووە.**

لە ڕۆژی دیاریکراودا، کوڕەکان گەڕانەوە ماڵەوە. باوك داوای لێکردن چاکترین کاری خۆیان بڵێن.

کوڕی یەکەم وتی: (بازرگانێکی دەوڵەمەند هەموو پارەی خۆی بۆ وەبەرهێنان بە من سپارد، منیش بە هەڵگرتنی سەرمایەکەی ئەو، ڕاستگۆیانە خستمەگەڕ و بە قازانجەوە بۆم گەڕاندەوە).

باوك وتی: (بە ڕاستی لەکارەکەی خۆتدا پێگەیشتوویی پیشانداوە، بەڵام ئەمە تاکە ئەرکێك بووە لەسەرت کە بیکەیت).

کوڕی دووەمیان وتی: (بەدرێژایی سەفەرەکەم، کاتێك کە لە کەناری دەریا پیاسەم دەکرد، منداڵێکی ساوام بینی کە خەریك بوو نقوم دەبوو. بە هەستکردن بە مەترسی لەسەری، خێرا خۆم هەڵدایە ناو شەپۆلە هەڵچووەکانی ئاو و گیانیم ڕزگار کرد).

باوك لە وەڵامداوتی: (كورەكەم! رەفتارێكی بوێرانەت هەبووە، بەڵام نەك ئەوەندەی كە شایستەی بەدەستهێنانی مستیلەیەكی وەها گرانبەها بێت!)

نۆرەی گەنجترین كوڕ هات، ئەو وتی: (مەڕەكانم لە شاخەكاندا دەلەوەڕاند، یەكێك لە سەرسەختترین دوژمنەكانم لە لێواری هەڵدێرێكەوە سەری سوڕا و بەر بووەوە. ئەو بە ترسێكی زۆرەوە بە هەڵدێرەكەوە هەلواسرابوو كە دەستبەجێ چووم بە هانایەوە ژیانیم رزگار كرد).

باوك وتی: (تۆ مایەی سەرفرازی و خۆشی منیت، خراپەت بە چاكە وەڵامدایەوە كە بەنرخترین رەفتارە. مستیلەكە شایستەی خۆیە!)

**سەرنج:** وایدابنێ تۆ كەسێكیت تەواو پەیوەستیت بە رێساكانی شۆفێرییەوە. بەیانیی رۆژێكیان بە بیركردنەوەیەكی پۆزەتیڤ و رۆحیەتێكی بەرزەوە لە ماڵ بەرەو شوێنی كار دەردەچیت. بە هێمنییەوە خەریكی لێخوڕینیت كە لەپڕ ئۆتۆمبێلێك بە دوورایی میلیمەترێك لەلای راستەوە پێشت دەكەوێتەوە. دەستەوستان دەبیت و نائاگایانە سوكان بەلای چەپدا دەشكێنیتەوە.

فەزای ئەقڵی و رۆحیت یەكلایەنە دەگۆڕێت. ئارامی دەبێتە ترس و ترس دەبێتە توڕەیی. شەق ئەبەیت، لەبەر خۆتەوە دەڵێیت: (نابێ بەو شێوەیە لێخوڕێت. ئێستا چاری دەكەم).

پێ لە بەنزین دەنێیت و بەخێرایی هەوڵ دەدەیت خۆت بگەیەنیتە شۆفێرە بێ مێشكەكە. ئەو بە خێرایی لەنێوان ئۆتۆمبێلەكانەوە دەردەچێت و تۆش بۆ گەیشتن پێی ناچاریت وەكو ئەو بەخێراییەكی تەواو و بە پێشكەوتنەوەی سەرپێچیكارانە لێخوڕیت.

مۆدێلی شۆفێریت بە تەواوی گۆڕاوە...

ئێستا شۆفێره بێ مێشکەکه بۆ گەڕەکێك پێچ دەکاتەوه و تۆ سەرباری ئەوەی کە لە شوێنی کارکردنت دوور دەکەویتەوه، بۆ سۆراخکردنی ئەو دەچیتە ناو پێچەکەوه. تۆ له ڕێڕەوی خۆت لاتداوه.

ئەم چیرۆکە بەباشی شرۆڤەی میکانیزمی تۆڵە دەکات. تۆ بۆ تۆڵەکردنەوه لە ڕێڕەوی خۆت لا دەدەیت و دەبیتە کەسێك کە لەهەڵبژاردنی خۆتەوه نییە، بەڵکو هۆکاری دەرەکی لە پشتەوەیە.

گاڵتەجارپی تۆڵە ئەوەیە کە تۆ بۆ قەرەبوکردنەوه بکەویتە ئاستێك کە پێشتر ڕەخنەت لەو ئاستە هەبووه. تۆ ڕقت لەو مۆدێلەی ڕەفتارە، بەڵام لە هەنگاوێکی قەرەبوکردنەوەدا سوود لەو مۆدێلە وەردەگریت. تۆ ڕەخنە لە زمانی توندوتیژانەی ئەوانیتر دەگریت بەڵام بۆ قەرەبوکردنەوه، خراپەکاری دەکەیت.

تۆ ڕەخنە لە سەرپێچی دەگریت بەڵام بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەوەی کە روویدا، سەرپێچی دەکەیت. تۆ ڕەخنە لە ناپیاوی دەگریت، بەڵام بەوەی کە بە لایەنی بەرانبەر بڵێیت حەقیەتی بەهۆی کردارە ناویژدانانەکەی، ناپیاوانە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەیت.

پرسێکی گرنگ کە پشتگوێی دەخەین ئەوەیە کە **ئەگەر لایەنی بەرانبەر شایستەی ئەوەیە خراپەی بەرانبەر بکرێت، ئێمە شایستەی ئەنجامدانی خراپەکاری نین**).

درۆمان لەگەڵ دەکەن و هەست دەکەین لایەنی بەرانبەر موستەحەقی ئەوەیە درۆ ببیستێتەوه. بەڵام ئایا ئێمەش لەو ئاستەداین کە درۆ بکەین؟

هەروەکو چۆن لە دەستەواژەی (العین بالعین) دیارە، لە تۆڵە و حەق بە حەقدا، دەبینە کەسێك کە ئەو بە شایستەی سزا دەبینین. خاڵێك کە پێویستە بیڵێم ئەوەیە کە **تۆڵە پڕوپوچترین فۆرمی لاساییکردنەوەیە**...

لە تۆڵەدا سەرچاوەی لاساییکردنەوەی تۆ کەسێکە کە لێی زویریت و کردارەکەی قبوڵکراو نییە، بەڵام تۆ رەفتارە قبوڵنەکراوەکەی ئەو دووبارە دەکەیتەوە.

تۆڵە واتە ئەوەی کە هەیت نەك هەڵبژاردنی تۆ کە کارتێکراوە بەوەیَ کە دۆخی ئەوانیترە.

تۆڵە دیارترین شێوەی کەوتنەژێر کاریگەرییە، چونکە لە تۆڵەدا تۆ نەك لەسەر بنەمای پێوەرە و ستانداردە کەسییەکانتان بەڵکو لە پەرچەکردارەکانتان بەرانبەر رەفتاری ئەوانیتر، بیردەکەیتەوە، هەست دەکەیت و رەفتار دەکەیت.

وەکو ئاوێنە بە لەبەرانبەر خراپە و چاکەدا
لەبەرانبەر سوێرەخاکی زەمانەدا وەکو ئاو
یەکسان بە

(تاهیر شیرازی)

# سەربازی دانیمارکی

دانیمارك و سوید لە سەدەی حەڤدەی زایینیدا گیرۆدەی جەنگێکی بەردەوام بوون لەگەڵ یەکتریدا. لە یەکێك لە جەنگەکان و دوای پاشەکشەی سویدییەکان، سەربازێکی دانیمارکی کە برینێکی سوکی هەبوو، هەستی بە تینوێتی کرد. کاتێك دەستی بۆ مەتارەکە برد تا ئاو بخواتەوە، گوێی لە دەنگێکی لاواز بوو. ئەوەش دەنگی سەربازێکی سویدیی بریندار بوو کە داوای ئاوی دەکرد.

سەربازە دانیمارکییەکە بەرەو لای رۆیشت، لەلایەوە ئەژنۆی دادا تاوەکو لە ئاوی مەتارەکەی خۆی بداتە ئەو. رێك هەر لەو ساتەدا سەربازە سویدییەکە تەقەی لە سەربازە دانیمارکییەکە کرد. گوللەکە شانی بە سوکی بریندار کرد.

ئەو وتی: من ویستم ئاوت بدەمێ بەڵام تۆ ویستت بمکوژیت. ئەمە پاداشتی من بوو؟ من مەبەستم بوو هەموو ئاوی مەتارەکەمت بدەمێ. بەڵام ئێستا کە ئەمەت کرد تەنیا نیوەی ئاوەکەت دەدەمێ...

یەکێك لە ئەفسەرانی سوپای دانیمارك کە لە نزیکەوە بەسەرهاتەکەی بینی، پاشای دانیمارکی لێ ئاگادار کردەوە. پاشا، بانگی سەربازەکەی کرد.

—بۆچی نیوەی ئاوی مەتارەکەی خۆت دایە دوژمنێك کە دەیویست بتکوژێت؟

سەربازەکە لە وەڵامدا وتی: (هەرچەندە ئەو دەیویست بمکوژێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت مرۆڤێکی بریندار بوو مرۆڤایەتی وایلێکردم ئاو بدەمە کەسێکی تینوو و بریندار).

پاشا وتی: (ئافەرین! تۆ شایستەی ئەوەیت کە فەرماندەی سوپای من بیت).

**سەرنج:** لەگەڵ هەر کەسێکدا بەپێی ئاست و پێگەی خۆت رەفتار بکە نەك بەپێی ئاست و پێگەی خۆی. ئەگەر بەگوێرەی کرداری کەسەکە رەفتار بکەیتەوە ئەوا تۆی کردووە بە کارتێکراوێکی رەها و بێ ئیرادە.

لاوازی دەکەویتە ژێر کاریگەرییەوە هێز کاریگەری
دروست دەکات .

(تیۆرەی هێز)

چەندەی بەهێزتر بیت، لەبری ئەوەی کە بکەویتە
ژێر کاریگەرییەوە، کاریگەری دروست دەکەیت.

# چیرۆکی میسك

بە میسکیان وت: تۆ کێماسییەکت هەیە. لەگەڵ هەر کەسێك دانیشیت بۆنە خۆشەکەتی ئەدەیتێ.

وتی: چونکە ناڕوانمە ئەوەی لەگەڵ کێم، دەڕوانمە ئەوەی من کێم.

سەرنج: باشبوونی خۆت بەند مەکە بە باشبوونی ئەوانیتر. خراپبوونی خۆت بەهۆی خراپبوونی ئەوانیتر ئاراستە مەکە.

ئێمە ئاوێنە نین. ئێمە مرۆڤین.

بەهۆی ئەوەی کە هەیت خۆشەویستی بخەرە ڕووی ئەوانیتر نەك بەهۆی تایبەتمەندیی ئەوانیترەوە.

# ب: چیرۆکەکانی ڕەفتارە پەرچەکردارەکان: توندوتیژی
# چیرۆکی دوو دوکاندار

دوو دوکاندار لەسەر حساب و کتاب دەستیانکرد بە دەمەقالێ. دەنگیان بە رادەیەك بەرز بووەوە کە هەموو خەڵکانی بازاڕ و کاسبەکان بە ناکۆکی ئەوانیان زانی. بێگومان هەندێك کەس بۆ ناوبژیوانی و هەندێکیش بۆ خۆتێهەڵقورتاندن لەدەوریان کۆ بوونەوە. یەکێك لە هاوڕێ هاوبەشەکانی هەردووکیان لەگەڵ کەسێکدا کە لە شارێکی ترەوە هاتبوو و میوانی بوو بە بیستنی دەنگەدەنگەکە خۆی گەیاندە شوێنەکە.

کابرای غەریبە بە بینینی توندیی ناکۆکییەکە و ئاستی هەڵچوونی هەردوولا چاوەڕێ بوو رووبەڕووبوونەوە زارەکییەکە ببێتە پێکدادانی جەستەیی. بەڵام خانەخوێکە ململانێی جەستەیی بەدوور دەزانی. ئەو ڕوونی کردەوە: لە شاری ئێمەدا یاسا و باوەڕێکی نەنوسراوە لەناو خەڵکدا باڵادەستە، بەو مانایەی کە لە ململانێی ئەو کەسەی کە یەکەم جار دەستیداوەتە توندوتیژی و هێزی جەستەیی بەکارهێناوە، دانی بەوەداناوە کە ئۆقرە، خۆگرتن و هێزی لۆژیکی نییە و لەبەرئەوەی هیچی لە هەگبەدا نییە وەکو دوایین پەنا ئامرازی زەبروزەنگ بەکار دێنێت...

**سەرنج:** کاتێك مرۆڤ هێزی لۆژیکی نییە بۆ کاریگەری دانان و هێور کردنی لایەنی بەرانبەر ئەوا دەست دەداتە توندوتیژی. توندوتیژی واتە نەبوونی هێزی تاکەکەس لە قەناعەتپێهێنانی لایەنی بەرانبەردا. کەسانی بێ کاریگەری، پەنا دەبەنە بەر زەبروزەنگ.

# ڕەفتارە پەرچەکردارەکان: لاساییکردنەوەی کوێرانە
# ئەسپی خۆپارێز

جەمال کە شەیدای مامۆستاکەی بوو بڕیاریدا هەموو جوڵەکانی مامۆستاکەی لەبەرچاو بگرێت. پێی وابوو ئەگەر لاسایی کردارەکانی بکاتەوە ئەوا هەمان ژیری ئەویش بەدەست دێنێت.

مامۆستا تەنیا جلی سپی لەبەر دەکرد قوتابییەکەش تەنیا جلی سپی لەبەر دەکرد. مامۆستا سەوزەخۆر بوو قوتابییەکەش لە خواردنی گۆشت دوور کەوتەوە و بووە بە سەوزەخۆر. مامۆستا زۆر خۆی دەخستە ناو سەختییەوە، قوتابییەکەش بڕیاریدا سەختی بچێژێت و لەسەر پوش خەوت.

ماوەیەك تێپەڕی. مامۆستا بە ڕەفتارەکانی قوتابییەکەی زانی. چوو تا بزانێ چ باسە. قوتابییەکە وتی: خەریکی بەسەربردنی قۆناغەکانی بەرزیم.

سپیی جلەکانم نیشانەی سادەیی و گەڕانە.

سەوزەخۆرییەکەم جەستەم پاك دەکاتەوە.

خۆپارێزی و سەخت چێژییەکەم دەبێتە هۆی ئەوەی کە تەنیا بیر لە ڕۆحانیەت بکەمەوە.

مامۆستا پێکەنی و ئەوی بردە دەشتێك کە ئەسپێك پیایدا ڕەت دەبوو. پاشان وتی: (بەدرێژایی ئەم ماوەیە تەنیا ڕوانیوتە دەرەوە لەکاتێکدا کە ئەمە گرنگییەکی کەمی هەیە. ئەو ئاژەڵە ئەبینیت؟ ئەویش بەو مووە سپییانەیەوە،

تەنیا سەوزە دەخوات و لە کادێنێکدا لەسەر پوش دەخەوێت . پێت وایە قەدیسە یان رۆژێك لە رۆژان دەبێتە مامۆستایەکی راستەقینە؟)

**سەرنج:**

١-خۆت خۆشبوێ

٢-نرخ بۆ خۆت دابنێ

٣-بایەخ بە خۆت بدە

٤-خۆت بێ مەرج قبولٚ بکە

٥-رێز لە خۆت بگرە

ئەمە وانە بنەڕەتییەکانی عزەت نەفسن کە بۆ سەلامەتی و ئارامی دەروون ناچارین لەبیرمان بن و بیانخەینە کار بە پێچەوانەوە دووچاری حالەتی لەخۆبێزاربوون و لەخۆبێگانەبوون دەبینەوە بەجۆرێك کە بە روانین لە دەرەوە هەولێکی کوشندە ئەگرینە بەر بۆ بوون بە هاوشێوەی ئەوانیتر. هەولێك کە دەرەنجام و وێنەدانەوەی بایەخدان و رێزگرتنە لە خۆ، بێ هاوتا و ناوازەیە. هەلبەت کردنە سەرمەشقی ئەو کەسانەی کە لە بوارە ناوەکی و دەرەکییەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە پرەنسیپێکی ژیرانەیە، بەلام خۆدۆڕاندن و خۆ فەرامۆشکردن و رێزێکی بەحەسرەت بۆ ئەوانیتر بەهۆی ناشایستە لەقەلەمدانی خۆ، هەلەیەکی مەعریفییە و لەهەمان کاتدا هەلەیەکی پڕ خەسارەتیشە.

# چیرۆکی دوو بۆق

بۆقە بچکۆلەکە باسی گایەکی گەورەی بۆ بۆقە پیرەکە دەکرد،

بۆقە پیرەکە وتی: من دەتووانم خۆم بەو ئەندازەیە گەورە بکەم، تۆ دەتووانی خۆت ببینیت. پاشان فوی کردە خۆی و ئاوسا. پاشان لە بۆقە بچوکەکەی پرسی: ئەوەندە گەورە دەبوو؟

بۆقە بچوکەکە کە حەماسەت گرتبووی، وتی: زۆر لەمە گەورەتر بوو. بۆقە پیرەکە دووبارە زیاتر بای کردە خۆی و پرسیاری کرد: ئەو گایە لەمەش گەورەتر بوو؟ دیسان بۆقە بچوکەکە لە وەڵامدا وتی: گەورەتر بوو باوکە، گەورەتر.

بۆقە پیرەکە دووبارە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بایەکی زیاتر کردە خۆی و گەورە و گەورەتر بوو. پاشان بە کوڕەکەی وت: من دڵنیام ئەو گایە نێرە لەم قەبارەیە گەورەتر نەبوو. بەڵام لە ساتێکدا بۆقە پیرەکە کە بایەکی زۆری کردبووە خۆی تەقی.

**سەرنج:** هەندێ جار لاساییکردنەوە جۆرێکە لە خۆکوشتن.

# وانەی نیگارکێشان

ئەلبێرتی بچکۆلە قوتابی حەوت ساڵان پۆلی یەکی بنەڕەتی بوو. قوتابخانەکە زۆر گەورە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك زانی کە دەرگای پۆلەکە راستەوخۆ بەرەو دەرەوە دەکرێتەوە و بە ئاسانی دەتووانێت بچێتە ناو پۆلەوە، دڵخۆش بوو چونکە بەلایەوە قوتابخانەکە لەرادەبەدەر گەورە نەبوو.

بەیانیی رۆژێکیان مامۆستا وتی: (ئەمرۆ دەمانەوێ وێنە بکێشین).

ئەلبێرت لەبەر خۆیەوە وتی: (زۆر باشە) چونکە ئەو زۆر حەزی لە نیگارکێشان بوو و دەیتووانی زۆر بەئاسانی وێنەی زۆرێك لە شتەکان بکێشێت، شێر، بەور، شەمەنەفەر، جوجەڵە و...

بۆیە پاکەتی قەڵەم رەنگەکانی دەرهێنا و دەستیکرد بە وێنە کێشان. بەڵام مامۆستا وتی: (جارێ دەست پێمەکەن، چاوەڕێ بن تا هەمووان ئامادە دەبن). پاشان وتی: ئەمرۆ دەمانەوێ وێنەی گوڵ بکێشین.

ئەلبێرت لەبەر خۆیەوە وتی: زۆر باشە. ئەو زۆر حەزی لە کێشانی وێنەی گوڵ بوو. دەستیپێکرد. بە قەڵەم رەنگەکانی پەمەیی، نارنجی و شین وێنەی گوڵێکی کێشا. بەڵام مامۆستا وتی: (چاوەڕێ بن، من پیشانتان دەدەم چۆن وێنەی گوڵ بکێشن) و گوڵێکی پەمەیی بە قەدێکی سەوزەوە کێشا. پاشان وتی: ئێستا دەتووانن دەست پێبکەن.

ئەلبێرت سەیرێکی نیگارەکەی مامۆستای کرد و پاشان سەیرێکی نیگارەکەی خۆی کرد. ئەو گوڵەی کە خۆی کێشابووی زیاتر خۆش دەویست. بەڵام هیچی

نەوت، کاغەزەکەی هەڵگرتەوە و لەسەر تەختەڕەشەکە هەر ئەو گوڵە پەمەییەی بە قەدی سەوزەوە کێشا. ڕۆژی دواتر مامۆستا وتی: (منداڵەکان ئەمڕۆ دەمانەوێ یاری هەویر بکەین).

ئەلبێرت لەبەر خۆیەوە وتی: (زۆر باشە). دەیتووانی بە هەویر زۆر شت دروست بکات، مار، مشك، ئۆتۆمبێل، بارهەڵگر و...

بۆیە دەستیکرد بە ئیشکردن لەسەر هەویر. بەڵام لەو ساتەدا مامۆستا وتی: (ئەمڕۆ دەمانەوێ دەفرێك دروست بکەین). ئەلبێرت لەبەر خۆیەوە وتی: زۆر باشە. ئەو زۆر حەزی لە دروستکردنی دەفر بوو. پاشان دەستیکرد بە دروستکردنی دەفرەکە بەو شێوە و قەبارەیەی کە خۆی ئەیویست. بەڵام مامۆستا وتی: (چاوەڕێ بن، من پیشانتان دەدەم چۆن ئەم کارە بکەن). ئەو دەفرێکی گەورەی دروستکرد. پاشان وتی: (ئێستا دەتووانن دەست پێبکەن). ئەلبێرت سەیرێکی دەفرەکەی مامۆستای کرد پاشان روانیە ئەوەی خۆی. زیاتر حەزی لەو دەفرە بوو کە خۆی دروستی کردبوو. بەڵام دیسان هیچی نەوت. دەفرەکەی خۆی تێکدا و دانەیەکی وەکو ئەوەی مامۆستا دروست کرد.

لەو ڕۆژە بەدوا، ئەلبێرتی بچکۆلە کارەکانی بەو شێوەیەی کە خۆی دەیویست ئەنجام نەدەدا. پاش ماوەیەك کوڕەکە و خێزانەکەی ماڵیان بۆ شارێکی تر گواستەوە و ئەو ناچار بوو بچێتە قوتابخانەیەکی تر.

قوتابخانە نوێکە لە قوتابخانەکەی پێشوو بچوکتر بوو. پۆلەکان دەرگای وەهایان نەبوو کە بەرەو دەرەوە بکرێنەوە. لە ڕۆژی یەکەمی قوتابخانەی نوێدا، مامۆستا وتی: (منداڵانی خۆشەویست، ئەمڕۆ دەمانەوێ نیگار بکێشین). ئەلبێرت لەبەر خۆیەوە وتی: زۆر باشە. ئینجا چاوەڕێ بوو تا مامۆستا پێی بڵێت چی بکات. بەڵام چەندەی چاوەڕوان بوو مامۆستا هیچی نەوت. ئەو تەنیا لە پۆلدا

پیاسەی دەکرد. کاتێك گەیشتە ئەلبێرت، وتی: (ناتەویَ نیگار بکێشیت؟) ئەلبێرت وتی: ( با دەمەویَ، بەڵام دەبێ وێنەی چی بکێشم؟)

مامۆستا نوێکە وتی: (نازانم، هەرچییەك کە حەز دەکەیت؟)

ئەلبێرت وتی: (بە هەر رەنگێك بێت؟)

مامۆستا وتی: (بەڵێ).

ئەلبێرت بە خۆشحاڵییەوە دەستیپێکرد و بە رەنگی پەمەیی، نارنجی و شین وێنەی گوڵێکی کێشا. ئەو زیاتر حەزی لە قوتابخانە نوێکەی بوو. هەرچەندە پۆلە نوێکەی دەرگایەکی وەهای نەبوو کە بەرەو دەرەوە بکرێتەوە.

خــەڵك ئاشــی بەڵگەنەویســتەکان دەســوڕێنن و دەسـوڕێنن، بـەڵام هـیچ شـتێکی لـێ دەرناچـێت جگەلــەوەی کــە تیایــەتی. بــەڵام کاتێــك بــۆ ســۆراخکردنی بــیری نــویێ نەریتــەکان جــێ دەهێڵن،شـیعر، هەسـت، فەرزیڵـەت، زانـین، دەسـت لەناو دەستی یەکتری دێنە هانایان بۆ ڕێنوێنییان.

(رالف والدۆ ئیمێرسن)

# ڕەفتارە پەرچەکردارەکان:
# گرتنەبەری (دەبێ) و (نابێ)یە بۆماوەییەکان نەریتی کۆن

لە بیاباندا، بـەهۆی نـەبوونی ئـاو و درەختـەوە، میـوە کـەم بـوو. گـەورەکان و داناکانی قەومەکە کۆ بوونەوە و بڕیاریاندا کە:

–هەموو کەسێك دەبێ لە ڕۆژێکدا تەنیا یەك میوە بخوات.

ئەم یاسایە بە درێژایی چـەند نەوەیـەك بـەردەوام بـوو و ژینگـەی ئـەو ناوچـەیە پارێزرا. تۆوی میوەکان کەوتنە سەر زەوی و درەختی نوێ ڕوان.

ماوەیەك دواتر، ئەو ناوچەیە بووە شوێنێکی بەبەرهەم و بـووە جێـی سـتایش و چـاوتێبڕینی خـەڵکی شـارەکانی دەوروبـەر. بـەڵام خـەڵکی هێشـتا ڕۆژانـە تـەنیا میوەیەکیان دەخوارد و لەسەر ئەو ڕێسایە مابوونەوە کە گەورەکان و پێشـینانیان دایاننـابوو. سـەرباری ئەمـەش، نەیاندەهێشـت خـەڵکانی شـارەکان و دێهاتـەکانی

دراوسێش سوود لە میوەکان وەربگرن. ئەمە بووەهۆی ئەوەی کە میوەکان بکەونە سەر زەوی و بڕزن و ژینگەکەش پیس بکەن.

دانایەك لەناو ئەو قەومەدا بۆ باشکردنی بارودۆخەکە وتی: (لێگەڕێن خەڵکی هەرچییەك ئەیانەوێت بیخۆن و میوەکان لەگەڵ دراوسێکانی خۆتاندا دابەش بکەن).

بەڵام کاتێك پەیامەکەی بڵاو کردەوە رەخنەی لێگرا و بەردبارانیان کرد. چونکە ئەو (دەبێ)یە کۆنە رەگی لە جەستە و رۆحی خەڵکدا داکوتابوو و نەدەکرا بە ئاسانی بیگۆڕیت.

پەیتا پەیتا گەنجانی ئەو ناوچەیە لە خۆیان دەپرسی ئەم نەریتە بەرایی و بێ مانایە لەکوێوە هاتووە؟ بۆچی دەبێ ئێمە کوێرانە پەیڕەوی لەم یاسا کوێرانەیە بکەین کە ژیانی بۆ هەمووان دژوار کردووە؟

بەڵام نەدەکرا نەریتی کۆن وا بە ئاسانی بخەیتە ژێر پرسیارەوە. بۆیە گەنجەکان بڕیارياندا واز لە ئایینەکەیان بێنن. بەم شێوەیە، دەیانتووانی چەنێك میوەیان ئەوێ، بیخۆن و بەشەکەی تری بدەنە ئەوانەی کە پێویستیانە.

ئەوانەی کە خۆیان بە باوەڕدار لەقەڵەم دەدا، وەفادار مانەوە بەرانبەر رێبازی کۆن و دەبێ و نابێیەکان. بەڵام لە راستیدا، ئەوان لەوە تێنەدەگەیشتن کە دنیا گۆڕاوە و بۆئەوەی ژیانێکی باشتری هەبێت، پێویستە نەرم بێت و خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی دنیا بگونجێنێت.

**سەرنج:** دنیا دووبارەکەرەوانی زۆرینە و کەمینەی گۆڕانکارانی کاریگەرە. هەموو وەرچەرخان و گۆڕانکارییە گەورەکان بە دەستی گروپی دووەم مەیسەر بووە. قبوڵکردنی مۆدێل و پارادایمە جێگیر کراو و عورفییەکان پێویستیان بە هیچ هەوڵ و کۆششێکی تاقەتبەر نییە. ئەوەندە بەسە کە وەکو ماسییەکی مردووی

چاوبەستراو خۆت بە تەوژمی رووبار بسپێریت. بەڵام جوڵە بە پێچەوانەی تەوژمی ئاوی زۆرینە پێویستی بە بوێری و ئازایەتییەکی زۆر هەیە.

دەبێ متمانەت بە خۆت هەبێت و ئیمان بە هێز ئەقڵانیەتی تاکەکەسی بێنیت لە دۆزینەوەی راستییەکاندا. بۆ هێنانەکایەی گۆڕانکاریی گەورە، دەبێ لە دەرکەوتن نەترسید و باکت بەوە نەبێت کە لە (کەمینە)دایت. نابێ مل بۆ سەپاندنی (دەسەلات)ی کۆ بیت.

> **کەسێك کە بیەوێ سەرپەرشتیارێتی ئۆرکێستڕا بکات، دەبێ پشتی لە خەڵك بکات**
>
> **(جۆن.سی.ماکسوێل)**

**دەبێ عەزابی تەنیایی بچێژیت...**

دکتۆر عەلی شەریعتی لە کتێبی روانینێك بۆ مێژووی سبەینێ کۆمەڵگەی بۆ سێ گروپی بلیمەتەکان، رۆشنبیران و خەڵکی رەشۆکی دابەش دەکات.

بلیمەتەکان ئەو کەسانەن کە لەسەرەوەی هەرەمی کۆمەڵگەدان. ئەو نەریت شکێنانەن کە خاوەنی بیرورِا و تیۆرەی نوێ و بێ پێشینەن. ئەوان گومانگەرا و پرسیارکەرن. بەڵام نابێت وێنای ئەوە بکەیت کە بلیمەتبوون تاکەکەس دەکاتە جێی رەزامەندی خەڵکی رەشۆکی. ئەم وێنایەی کەبلیمەتە کاریگەرەکان لەلایەن خەڵکی رەشۆکییەوە دەگیرێنەخۆ بە جۆرێك کە بە بیروباوەڕ و داهێنانە نوێکانیان، خەڵکی وەکو قارەمانانی خۆیان رێزیان لێ دەگرتن، وێنایەکی هەڵەیە بگرە تەواو بە پێچەوانەوە، خەڵکی بە تێنەگەیشتن و نەناسینی تیۆرەکانیان و

بیذینی ئەو هەڕەشە و هێرشەی کە لەلایەن بلیمەتەکانەوە لەدژی پرەنسیپ و نەریتە قووڵەکان ئەنجامدرابوو، رووبەڕوویان بوونەوە.

دوورخستنەوە، ئەشکەنجە، دەستبەسەرکردن لە ماڵەوە، زینـدانیکردن و تەنانەت کوشتنیش، کاردانەوەی کۆمەڵگەیە بەرانبەر هەوڵەکانی بلیمەتەکان. سەربوردە و چارەنووسی ئەوانەی بە جیاواز بیریان کردووەتەوە، وەکو مەسیح، حەلاج، گالیلۆ و مەلا سەدرا، ئیبراهیم و ...نموونەی رووبەڕووبوونەوەی سەرسەختانەی کۆمەڵگەن لەگەڵ ئەو رێبەرانەی کە دروشمی گۆڕانیان بەرز کردووەتەوە.

جارێك موشریك و جارێك دەهری و کافر دەبێ

جارێك دوژمنی خەڵك و فیتنەگێڕ دەبێ

دەبێ عەزابی تەنیایی بچێژێت

ئەو کەسەی لەسەروو سەردەمی خۆیەوە بێ

**(شەفیعی کەدکەنی)**

رۆشنبیرانی پەیامی تێگەیشتن و هەرسکردن و گواستنەوە و رەنگدانەوەی تیۆرەکانی بلیمەتەکانیان بۆ خەڵك لە ئەستۆیە. تەنیا تێپەڕینی کات و رەوگەی وەرچەرخانەکان، راستبووی هەوڵەکانی بلیمەتە کاریگەرەکان دەسەلمێنێت.

لە بنەڕەتدا، نەریتە جاهیلی و خورافییەکان رەوایەتی خۆیان لە دوو سەرچاوەی گەورەوە وەردەگرن:

١-پێشەنگی بوونی درێژخایەن و هەندێ جار چەندهەزار ساڵەیان.

٢-ژمارەی زۆری ئەو باوەڕدارانەی کە لە رابردوو و ئێستادا شوێنیان دەکەون. زۆربەی خەڵکی، دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم دوو لایەنە. ئەگەر ئەو بوارانەش بدۆزنەوە کە لەگەڵ پێوەرە ئەقلی و لۆژیکییەکاندا نایەتەوە ئەوا لەبەر خۆیانەوە

دەڵێن، ئەرێ دەکرێت ئەم ژمارەیەی خەڵك بەدرێژایی مێژوو هەڵەیان کردبێت و درکیان بە نائەقڵانی بوونی نەکردبێت. ئەبێ من چی بم تا راست و دروست بیر بکەمەوە و ئەوانیتر هەڵە بن.

ئەم باوەڕبەخۆنەبوونە مۆڵەتی گومان و پرسیارکردنیان لێ دەسێنێت و ئەمەش کتومت پێچەوانەی تێڕوانینی کەسانی کاریگەرە. ئەوان بە ئیمان و باوەڕی تۆکمەی سەرچاوەگرتوو لە متمانەبوون بە هێزی بیرکردنەوە و ئیرادەی مرۆییان بە تەوری پرسیارکردن دەکەونە وێزەی بتەکانی تێڕوانین، ئایینزا و نەریتە دژە ئەقڵە کۆنەکان و لەناویان دەبەن.

به تەنیا دەنگ لە هیچ دەستێ هەڵناسێ

(سایب تەبریزی)

بەنـــدەی شـــەهوەت لـــە.بەندەیـــەکی

رەشپێستی چەوساوە زەلیل ترە.

(ئیمامی عەلی)

## رەفتارە پەرچەکردارەکان: شەهوەت پەرستی ئەم ژنە داوێن پیسە

بودا بۆ گوندێك سەفەرێکی کرد. ژنێك کە بەلای قسـەکانیدا بـەکێش ببـوو داوای لە بودا کرد تا ببێتە میوانی. بودا قبوڵی کرد و چووە ماڵی ژنەکە.

کوێخای گوند بە شپرزەییەوە خۆی گەیاندە بودا و وتی: (ئەم ژنە، داوێن پیسە و مەچۆرە ماڵیان). بودا بە کوێخای وت: (دەستێکت بدە دەسـتم). کوێخـا سـەری سوڕما و دەستێکی خستە ناو دەستی بـوداوە. ئینجـا بـودا وتـی: (ئێسـتا چـەپڵە لێدە). کوێخا زیاتر سەری سـوڕما و وتـی: (هـیچ کەسـێك ناتووانێـت بـە دەسـتێك چەپڵە لێبدات).

بودا بزەیەکی کرد و وەڵامی دایەوە: (هیچ ژنێکیش ناتووانێت بە تەنیایی خـراپ و داوێن پیس بێت، مەگەر ئەوەی کە هەندێ لە پیاوانی گوندیش داوێن پـیس بـن. بۆیە پیاوان و پارەکانیانن کە ئەم ژنە و هەژارییەکەی بەکار دەبەن و ژنێکی داوێن پیسیان لێ دروستکردووە).

**ســەرنج:** خۆکـۆنترۆڵکردن بنچـینەی نەکەوتنــەژێر کاریگەرییــە. مرۆڤێـك کـە نەتووانێت غەریزە و ئارەزووەکانی جەستەی خۆی کۆنترۆڵ بکـات ئـەوا دەکەوێتـە

ژێر جڵەوی ئەم هێزانە بە جۆرێك كە لە پێگەی كۆنترۆڵكردنەوە دەكەوێتە پێگەی چوونەژێر كۆنترۆڵ. ئەم مرۆڤە دەبێتە بێ دەسەڵات و بێ ئیرادە بەجۆرێك كە هەموو بڕیار و ڕەفتارەكانی لەژێر كاریگەریی نەفسدا دەبێت.

با گۆڕینی دنیا بە گۆڕینی ناخمان دەست پێبكەین، چونكە یاسای ژیان ئەمەیە:ئەگەر كۆنترۆڵ نەكەین، كۆنترۆڵ دەكرێین.

هەر كەسێك كە زاڵ نییە بەسەر ناخدا          دەبێتە ملكەچی بێگانە

**(ئیقبال لاهوری)**

وازهێنـــان لـــه شـــههوهت و لهزهتـــهكان بهخشـــندهییه
هەركەسێك لەژێر شەهوەتەكاندا بڕوخێت هەڵناسێتەوە
(مەولەوی)

## (پاشا و دەروێش)

ڕۆژێكیان پاشا لەگەڵ دەست و پێوەندەكانی لە كۆشكەكەی چووە دەرەوە. لە ناوەڕاستی ڕێگادا بوو كە دەروێشێكی گەڕیدەی بینی. بۆ ڕەسمیاتی گەرم و گوڕی بەرانبەر ڕەعیەتەكەی بۆ ساتێك وەستا، هەموو یاوەران و دەوروبەریشی وەستان. ئەو دەروێشی دواند و وتی: شتێكمان لێ داوا بكە.

دەروێش لە وەڵامدا وتی: شەرمەزارم كە شتێك لە تۆ داوا بكەم لەكاتێكدا كە من دوو كۆیلەم هەن كە گەورەی تۆن.

پاشا سەری سوڕما و وتی:

ئەی پیرەمێرد تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ باسی چی دەكەیت؟ كۆیلەكانی تۆ چ كەسانێكن؟

حەكیم لەكاتێكدا كە ڕێگەی خۆی گرتبووە بەر وتی:

كۆیلەكانی من یەكێكیان تووڕەییە و ئەویتریان شەهوەتە. ئەوان لەدەستی مندا كۆیلەن، بەڵام ئەوانیتر و تۆ بەندە و كۆیلەی ئەوانن.

ئەوەندە بەسەر کە دڵێکی شادت هەبوو
ناتووانی بە ویستی هەموو کەسێك بژی
(سایب تەبریزی)

## ج: چیرۆکەکانی کەمیی هەستکردن بە زەنگینی و کاریگەربوون
## چیرۆکی

سەروەختی لەدایکبوونم لە نەخۆشخانەیەکی گشتیدا، باپیرەم بە دایکمی وت: تەنیا نەخۆشخانەی ئەهلی. دایکم وتی: بۆچی؟ ...وتی: خەڵکی چیمان پێ دەڵێن؟؟؟؟

دوایی ویستم بچمە قوتابخانە، قوتابخانەی سەرەرەوەی گەڕەکەکەمان. دایکم وتی: تەنیا قوتابخانەی سوودنەخواز. باوکم وتی: بۆچی؟ دایکم وتی: خەڵکی چیمان پێ دەڵێن؟؟؟؟

حەزم لە زانستە مرۆییەکان بوو. باوکم وتی: تەنیا ماتماتیك. وتم: بۆچی؟ وتی: خەڵکی چی دەڵێن؟؟؟

ویستم لەگەڵ کچێکی دێهاتیدا هاوسەرگیری بکەم. خوشکەکەم وتی: مەگەر من بمرم. وتم: بۆچی؟...وتی: خەڵکی چی دەڵێن؟؟؟

دەمویست پارەی مەراسیمی ژن گواستنەوە لە ژیانمدا کۆ بکەمەوە. باوك و دایکم وتیان: مەگەر بەسەر لاشەی ئێمەدا تێپەڕیت. وتم: بۆچی؟؟ وتیان: خەڵکی چی دەڵێن؟؟؟

دەمویست بەپێی پارەی گیرفانم خانوویەك لە خوارەوەی شار بەكرێ بگرم. دایكم وتی: هاوار لە من. وتم: بۆچی؟....وتی: خەڵكی چی دەڵێن؟؟؟

یەكەمین میوانداریی دوای هاوسەرگیرییەكەمان بوو. دەمویست سادە و گەرم و گوڕ بێت. هاوسەرەكەم وتی: هەروا زوو شكستت هێنا؟ وتم: بۆچی؟؟ وتی: خەڵكی چیمان پێ دەڵێن؟؟

دەمویست ئۆتۆمبێلێكی مۆدێل نزم بكڕم بەپێی توانام تا گۆچانی دەستم بێت. ژنەكەم وتی: خوا بمباتەوە. وتم: بۆچی؟ وتی: خەڵكی چی دەڵێن؟ منداڵەكەمان دەهاتە دنیاوە، لە نەخۆشخانەی گشتی. باوكم وتی: تەنیا نەخۆشخانەی تایبەتی. وتم بۆچی؟، وتی خەڵكی چیمان پێ دەڵێن؟

منداڵەكەم دەیویست بچێتە قوتابخانە...بوارەكەی هەڵبژێرێت، هاوسەرگیری بكات...

لە كۆتاییدا دەمویست بمرم. لەسەر گۆڕەكەم كردیانە شەڕ. كوڕەكەم وتی: كۆتایی گۆڕستان. ژنەكەم هاواری لێ هەڵسا. كچەكەم وتی: چی بووە؟...وتی: خەڵكی چی دەڵێن؟؟

مردم. براكەم بۆ مەراسیمی پرسە مزگەوتێكی سادەی هەڵبژارد. خوشكەكەم دەستیكرد بە گریان و وتی: خەڵكی چی دەڵێن؟

لە لایەكی گۆڕستانەكەدا بەردێكی سادەیان لەسەر مەزارەكەم دانا. بەڵام براكەم وتی: خەڵكی چی دەڵێن؟ خۆی داوای بەردە قەبرێكی بۆ كردم كە وێنەی منیان لەسەر هەڵكەند.

لێرەدا لە خەندەقێكی بەرتەنگ ماڵم دانا و هەموو سەرمایەكەم بۆ درێژەدان بە ژیان رستەیەك زیاتر نییە: خەڵكی چی دەڵێن؟؟

خەڵکێك کە تەمەنێك نیگەرانی قسەکانیان بووم ئێستا بۆ ساتێکیش نیگەرانی من نین.

**نیازبوون بە رەزامەندی ئەوانیتر، واتە دیدی تۆ بەرانبەر بە من گرنگترە لە بیروباوەڕی من بەرانبەر بە خۆم.**

**(وین دایەر)**

**سەرنج:** هەروەکو چۆن ئەم چیرۆکە پیشانی ئەدات لە لەدایکبوونمانەوە تا مردنمان و لە سەرەتا تا کۆتایی ژیانمان سەرنجمان لە دنیای دەرەوەیە و لە بڕیارەکانماندا حوکمی خەڵك بایەخێکی ستراتیژی هەیە. لەبری ئەوەی کە ئاگاداری نیازەکان، ویستەکان، حەز و توانا کەسییەکانی خۆمان بین؛ بە ژێرپێ خستنیان، قسەی خەڵکی دەکەینە مەحەکی بڕیارەکانمان و شێوازێکی ژیان هەڵدەبژێرین کە جێی رەزامەندی سەرچاوە دەرەکییەکان بێت. ئەمە گەورەترین ناپاکی و گەمژەییە کە کەم یان زۆر بەهۆی کەمیی هەستکردن بە زەنگینی و نەبوونی رێز لەخۆ گرتن تووشی دەبین.

ئێمە ئەوە هەڵدەبژێرین کە ئەوانیتر بۆمان هەڵبژێرن.

ئێمە بە جۆرێك ناژین کە پێمان خۆشە بەڵکو بە جۆرێك دەژین کە خۆشیان بوێن. بەم ستراتیژییەوە، گرنگترین شت کە دەبێتە قوربانی، راستگۆییە کە هەموو کەسێك بۆ سەربەخۆبوون و چێژوەرگرتن لەوەی کە ژیانی بەرهەمی هەڵبژاردنەکانی خۆیەتی، پێویستیەتی.

هەڵبەت چیرۆکی کەمیی هەستکردن بە زەنگینی تەنیا بە هەنگاوی بەرگریکارانەی وەکو گوێ هەڵخستن بۆ قسە کۆتایی نایەت بەڵکو تاکەکەسی خۆ

بەکەم زان بۆ کەمکردنەوەی هەستکردن بە نزمی دەپرژێتە سەر راکێشانی سەرنج و خۆسەلماندنی. بۆیە دوو رێگا دەگرێتە بەر:

١–هەوڵدان بۆ بینران

٢–هەوڵدان بۆ کەوتنەبەر ستایش و کاریگەربوون لە رێگەی پیشاندانی رووخسارێکی پفدراو و ساختە لە خۆی (ریا). دوایی باسی ئەم دوو هەوڵە دەکەم.

# ئەو مارمێلکەی کە چاویلکەی کردە چاو

مارمێلکێك چووە لای مارێك کە پزیشکی چاو بوو و داوای لێکرد چاویلکەی بۆ بکات. مارەکە وتی: (چاویلکە کوا بەکەڵکی تۆ دێت؟ خۆ تۆ چاویلکە لە چاو بکەیت و نەکەیت هیچ نابینیت).

مارمێلکەکە وتی: (چاویلکە لە چاو بکەم ئەبینرێم).

بچمە زانکۆ تا ببینرێم، بچمە مەکە تا ببینرێم، ببمە خوێنەر تا ببینرێم، کتێب بنووسم تا ببینرێم، خانوویەکی گەورەتر بکرم تا ببینرێم، کارێك جوانتر ئەنجام بدەم تا ببینرێم. هەر هەوڵێك پاڵنەرە بنچینەییەکەی بۆ ئەوە بێت کە ببینرێیت، ببیسترێیت و ستایش بکرێیت، نیشانەی گرێی سوکبوونە.

کۆچکردوو شێخ عەباسی قوم لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی ئەوە دەکات کە کاتێك کتێبی (منازل الآخره)ی نوسیووە و چاپی کردووە، لە قوم کەسێك هەبووە بەناوی (عەبدولرەزاق پەندبێژ) کە هەمیشە پێشنیوەڕۆ ئەحکامی شەرعی بۆ خەڵك باس کردووە. (کەربەلایی محەمەدرەزا)ی باوکی لەو کەسانە بووە کە حەزی لە مینبەری شێخ عەبدولرەزاق بووە، بە رادەیەك کە هەموو رۆژێك لە کۆڕەکەیدا ئامادە دەبوو شێخیش پاش گێڕانەوەی قسەکەی، کتێبی (منازل الاخره)ی ئەوی کردووەتەوە و گێڕانەوە و فەرموودەکانی کتێبەکەی بۆ بیسەران و ئامادەبووان باس کردووەتەوە.

دەڵێت، رۆژێکیان هاتە ماڵەوە و بانگی کردم و وتی: شێخ عەباس! خۆزگە وەکو عەبدولرەزاق پەندبێژ ئەبوویت و دەتتوانی بچیتە سەر مینبەر و لەو کتێبەی کە ئەیخوێندەوە، تۆش بۆمانت ئەخوێندەوە.

چەند جارێك ویستم بڵێم باوکە گیان! ئەم کتێبە بەرهەمی منە بەڵام هەموو جۆرێك خۆم گرت و هیچم نەوت و تەنیا وتم نزا بکە خوداوەند موەفەقمان بکات.

## رێسایەك بۆ پەرەپێدانی سەرنجڕاکێشبوونی تاکەکەسی:

مرۆڤەکان بۆ رازیکردنی پێداویستییە دەروونی و سۆزییەکانیان سۆراخی بەدەستهێنانی رەزامەندی و بایەخپێدان دەکەن. بەڵام ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە کە چەندەی کەمتر بەدوای بەدەستهێنانی ئەم شتانە بین زیاتر و باشتر بەدەستیان دێنین:

ئەو مرۆڤانەی کە بایەخ و سەرنج نادەنە ئەوانیتر (سەرنجی سۆزخوازانە) زیاتر سەرنجی ئەوانیتر بەلای خۆیاندا بەکێش دەکەن.

ئەو مرۆڤانەی کە بەدوای بینراندا وێڵ نین زیاتر دەبینرێن.

ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی گوێ لێگیران ناکەن زیاتر دەبیسترێن.

ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی ستایشی ئەوانیتر ناکەن زیاتر ستایش دەکرێن.

ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی کەوتنەژێر کاریگەری ناکەن، زیاتر دەبنە جێی رەزامەندی و کاریگەر دەبن.

تەنیا ئەو کەسانە بەهێزن کە (دەتوانن) بیانەوێ نەبینرێن. مرۆڤی لاواز پڕە لە ئاواتی بینران.

خۆت بەو شێوەیەی کە نەبوویت پیشان دەدەیت
مەخابن بەو شێوەیەی کە دەرکەوتی نەبوویت.

## نە خانێك هاتووە نە خانێك ڕۆیشتووە

پیاوێکی هەژار بوو کە ئاواتەخواز بوو وەکو خانەدانەکان بژیت، بەڵام هەمیشە (هەشت)ەکەی بۆ گرەوی (نۆ) بوو. ڕۆژێك هاتە شار و لەگەڕانەوەیدا، کاڵەکێکی بۆ خواردنی نیوەڕۆی کڕی، لە شار چووە دەر و لەژێر سێبەری درەختێك دانیشت و سەرقاڵی خواردنی کاڵەکەکە بوو. کاتێك کاڵەکەکەی خوارد، وتی: تویکڵی کاڵەکەکە لێناکەمەوە بۆئەوەی هەرکەسێك بە ئێرەدا ڕەت بێت، بیبینێت و پێی وابێت خانێك کاڵەکی خواردووە و تویکڵەکەی دەستکاری نەکردووە).

کاتێك هەڵسا تا درێژە بە ڕێگاکەی بدات، حەیف بوو بەلایەوە تویکڵی کاڵەکەکە لێ نەکاتەوە و هەروا وازی لێ بێنێت. لەبەر خۆیەوە وتی: (تویکڵی کاڵەکەکە لێ دەکەمەوە و دەیخۆم بەڵام تویکڵ و تۆزەکەی لێرە جێ دەهێڵم. ئەو کاتە، هەر کەسێك بە ئێرەدا ڕەت ببێت، پێی وایە خانێك کاڵەکێکی خواردووە و تویکڵەکەشی داوەتە نۆکەرەکەی تا لێی بکاتەوە و بیخوات).

کابرای هەژار کاتێك تویکڵی کاڵەکەکەی لێکردەوە و خواردی و بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ. لە ڕێگا هێشتا خەیاڵی لای تویکڵ و تۆوی کاڵەکەکە بوو. لەبەر خۆیەوە وتی، دەگەڕێمەوە و تویکڵی کاڵەکەکەش دەخۆم، هەر تۆوەکە بمێنێتەوە بەسە. هەر کەسێك بێرەدا ڕەت بێت، لەبەر خۆیەوە دەڵێت، خانێکی دەوڵەمەند لێرەوە ڕەت بووە، خۆی کاڵەکەکەی خواردووە، نۆکەرەکەی تویکڵی کاڵەکەکەی

لێکردووەتەوە و خواردوویەتی و توێکڵەکەشی داوەتە وڵاخەکەی. خانێکی چەند گرنگە کە هەم نۆکەری هەبووە و هەم وڵاخ!

خواردنی توێکڵی کاڵەکەکەش تەواو بوو. ئێستا خانی خەیاڵی و تۆوی کاڵەکەکە مابوو. بەڵام چەندەی کردی نەیتوانی واز لە تۆوی کاڵەکەکەش بێنێت. کاتێك لە خواردنی تۆوەکەش تەواو بوو، وتی: (ئۆخەی! ئیسراحەتم کرد. ئێستا وەك ئەوە وایە نە خانێك هاتبێت و نە خانێك رۆیشتبێت. لە بنەڕەتدا هیچ خانێك بێرەدا رەت نەبووە و کاڵەکیشی پێنەبووە بیخوات).

**سەرنج:** کاڵەك خواردنەکەی خانە خەیاڵییەکە رەمزێکە بۆ ژیانی ئێمە. ئێمە دوو جۆر ژیانمان هەیە (کاڵەك دەخۆین) لە ناو کۆمەڵ و لە تەنیاییدا...

لەگەڵ هاوسەرەکەمان دوو جۆر رەفتارمان هەیە، لە ناو خەڵك و لە تەنیاییدا..

ئێمە بە دوو شێواز ئۆتۆمبێل لێدەخورین. ئەو کاتەی کە تەنیاین و ئەو کاتەش کە ئەوانیتر تەماشامان دەکەن...

ماڵەوەمان و شوێنی کارمان بە دوو شێوازە، ئەو کاتەی کە خۆمان تەنیاین و ئەو کاتەش کە میوانمان هەیە...

ئەمە بەو مانایەیە کە بوون و نەبوونی ئەوانیتر لە جۆری بوون و نەبوونی ئێمەدا کاریگەری هەیە. ئەمەی کە چۆن مرۆڤێك بین و چۆن چۆنی رەفتار بکەین، کارتێکراوە بەوەی ئاخۆ کەس رەفتاری ئێمە دەبینێت یان نا؟ (روانین لە سەرچاوەی دەرەکی) نەك ئەوەی کە ئەو رەفتارە دروستە یان نادروست (سەرچاوەی ناوەکی).

بەڵام دەبێ بزانین کەسێك ئەو رەفتارە ناشایستە و خراپەی کە لە ئامادەبوونی ئەوانیتردا ئەنجامی نادات و کاتێك تەنیایە ئەنجامی دەدات، دان بەوەدا دەنێت کە هیچ پێگە و نرخێك بۆ خۆی دانانێت.

ژن و مێردێک دەست لەناو دەستی یەکتریدا لە دارستانێکدا کە دەوری دەریاچەیەکی دابوو پیاسەیان دەکرد. درەختەکان گەمارۆیەکی باشیان دروستکردبوو. هەوا گەرم بوو و کەس لەو ناوە نەدەبینرا.

ئەوان لە گۆشەیەکدا دانیشتن و پێکەوەی گفتوگۆی تایبەتیان دەکرد کە لەناکاو گوێیان لە دەنگێکی گەورە بوو:

-گروپەکان گوێتان لە فەرمانی بێت...وریا بن...دەنگی پێیەکان ناو دارستانەکەی پڕ کرد.

**سەرنج:** دەڵێن کەسایەتی بنچینەیی ئێمە ئەو گوتار و کردارە دەگرێتەخۆ کە دوور لە چاوی ئەوانیتر ئەنجامیان دەدەین.

# پەیکەری ناتەواو

یەکێك لە بەرپرسانی پرۆژەی دروستکردنی ناوەندێکی کەلتووری سەردانی ئەم پرۆژەیەی کرد کە لە دروستکردندا بوو و پەیکەرسازێکی بینی کە سەرقاڵی پەیکەرەکەیە و بۆی دەرکەوت کە پەیکەرێکی دروستکراوی هاوشێوەش لەوێ هەیە.

بە سەرسوڕمانەوە لە پەیکەرتاشەکەی پرسی: ئەرێ لەم پەیکەرە دوو دانەتان پێویستە؟ پەیکەرتاشەکە بێ ئەوەی لا بکاتەوە وتی: نا، تەنیا یەك دانەمان پێویستە، بەڵام پەیکەری یەکەمیان، هەر لە سەرەتادا زیانی پێگەیشت.

بەرپرسیەکە، سەیرێکی پەیکەرە دروستکراوەکەی کرد و هیچ کەموکوڕییەکی بەدی نەکرد و لە پەیکەرتاشەکەی پرسی: ناتەواوییەکە لە کوێدایە؟

پەیکەرتاشەکە لەکاتێکدا کە سەرقاڵی کارەکەی بوو، وتی: رووشانێك بە لووتی پەیکەرەکەوەیە.

بەرپرسەکە لێی پرسی: دەتەوێ ئەم پەیکەرە لە کوێ دابنێیت؟ پەیکەرتاشەکە وتی: لەسەر ستوونێك بە بەرزایی شەش مەتر.

بەرپرسەکە وتی: ئەگەر لە بەرزاییەکی وەها دابنرێ کێ دەزانێت کە رووشانێك بە لوتییەوەیە.

پەیکەرتاشەکە ناوبری دایە کارەکەی، سەیرێکی بەرپرسەکەی کرد، بزەیەکی هات و وتی: من خۆ ئەوە دەزانم!

**سەرنج:** تراژیدیای ژیانی ئێمە مرۆڤ ئەوەیە کە بەهۆی کەمیی هەستکردن بە زەنگینیمان، وەسوەسەی هەڵسەنگاندمان هەیە، باش هاتنە بەرچاومان لە

باشبوون پێ چاکترە، بە میهرەبان بینرانمان لە میهرەبانبوون پێ باشترە، بەدەستێهنانی رێزمان لە بەڕێزبوون پێ چاکترە، بەهێزدەرکەوتنمان لە بەهێزبوون پێ چاکترە، هۆشیار هاتنەبەرچاومان لە هۆشیاربوون پێ چاکترە.

بەپێی تیۆرەی (خۆنوواندن) لە دەروونناسی کۆمەڵایەتیدا، لەویبوون و ئامادەبوونی ئەوانیتر حەزی تاکەکەس بۆ پیشاندانی وێنەیەک لەخۆی، زیاد دەکات.

لە ساڵی ١٩٨٨دا نۆرمەن تریپلت کە دەروونناس بوو بۆی دەرکەوت کە پایسکیلسواران کاتێك پێکەوە پێشبڕکێ دەکەن دەگەنە خێرایی زیاتر تا ئەو کاتەی کە بە تەنیایی ریکۆرد تۆمار دەکەن.

پرەنسیپی خۆنوێنی و یاسای کاریگەریی تەماشاچی لە فیزیای کوانتەمدا بەشێوەیەکی ترە:

بەپێی فیزیای کوانتەم کرداری تەماشاکردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو شتەی تەماشا دەکرێت بگۆڕێت. کوانتەم دەڵێت بەگەردیلەبوون و یان بەشەپۆل بوونی رووناکی بە تەواوی بەندە بە ئامادەبوونی بینەر. تەنیا ئامادەبوونی تەماشاچی کاریگەری دەخاتە سەر رەفتاری رووناکی (فۆتۆن). بەداخەوە ئەوەی کە هەین بەلامانەوە گرنگترە لەوەی کە دەبینرێین. ئەمەش دەستپێکی زۆرێك لە تایبەتمەندییەکانی گەندەڵبوونە وەکو درۆ و ریا...

# نوێژی خۆ نواندن

غەریبەیەك لە درێژەی سەفەرەکەیدا گەیشتە دەوروبەری شارێك. هەوا تاریك ببوو بۆیە بڕیاریدا شەو لە مزگەوتی دەرەوەی شار بەسەر ببات. هێشتا بە تەواوی خەوی پیانەکەوتبوو کە گوێی لە دەنگێك بوو. کەسێك هاتبووە ناو مزگەوتەکەوە.

ئەو بە هیوای ئەوەی کە تازە هاتووەکە سبەی بەیانی خەڵکی شار لە حاڵی غەریبەکە ئاگادار بکاتەوە و لەوێ شوێنکەوتە بۆ خۆی پەیدا بکات و خانە و دوکانێك بکاتەوە، بەبێ دەستنوێژگرتن کەوتە نوێژکردن و تاوەکو بەیانی هەر خەریکی چەمانەوە و هەستانەوە بوو و وا خۆی دەردەخست کە نوێژ دەکات.

کاتێك ڕۆژ بووەوە کابرای ساختەچی ڕوانییە دوای خۆی و بۆی دەرکەوت ئەو دەنگەی کە دوێنێ شەو گوێی لێ بووە مرۆڤ نەبووە بەڵکو سەگێکی وێڵگەڕ بووە کە هاتووەتە ناو مزگەوتەکە. ئەو بەدرێژایی شەولە حاڵەتی خۆدەرخستندا بەرانبەر سەگێك خەریکی خواپەرستی بووە!

ڕیا یەکێك لە گرنگترین ستراتیژی کارتێکردن کە لەلایەن لاوازەکانەوە دەخرێتەگەڕ.

کەسێك کە ڕێزلەخۆگرتن و خۆ گەورە بینینی کەمە، دەیەوێ بە فێڵ و ڕیا سەرنج ڕابکێشێت و بەرانبەرەکەی بخاتە ژێر کاریگەرییەوە. بێ ئاگا لەوەی کە هەوڵی ڕاستەوخۆ و بە ئەنقەست بۆ کاریگەری دانان، وێنەدەرەوەی ئەو

راستییە یە کە ئێمە بوونـەوەری کـارتێکراو بـەوانیترین و دەمانـەوێ بـە روانـین لـە دەرەوەن خۆمان بەرانبەر ئەوانیتر بسەلمێنین و خۆیان بەسەردا بسەپێنین.

**تیۆرەی هێز:**

**هیچ کاتێك وەکو ئەو کاتەی کە بەدوای کارتێکردنی ئەوانیتردا وێڵین، بوونی کارتێکراومان ئاشکرا نابێت.**

کەس لەسەر ئەم خاك و مزڵە زیندوو نامێنێ
بەڵام پریاسکەی راستیت هەر ئەمێنێ
(فیردەوسی)

# چیرۆکی کورتی (بەتاڵ بەستن)

لەم رۆژگارەدا (بەتاڵ بەستن) بە مانای درۆکردن و پۆزلێدان برەوی پەیدا کردووە. بەڵام پێشینەی ئەم وشەیە دەگەرێتەوە بۆ پێش دەیان ساڵ واتە سەردەمی پاشایەتی رەزاشا!

دەگێڕنەوە لە سەردەمی رەزاشادا بەهۆی کەمی چەك، هەندێ لەو پاسەوانانەی کە دەگەڕان تەنیا کیفی چەکەکەیان لە کەمەریان دەبەست و لەراستیدا چەکیان پێ نەبوو. دز و شەوگەڕەکان کاتێك بەمەسەلەیەیان دەزانی، بۆئەوەی یەکتری ئاگادار بکەنەوە بە یەکتریان دەوت: (بە بەتاڵی بەستوویەتی) و مەبەستیشیان ئەوە بوو کە فلان پاسەوان چەکی پێ نییە و کیفی چەکەکەی بە بەتاڵی لە کەمەری بەستووە و هەر لەسەر ئەم بنەمایە بوو کە زاراوەی بەتاڵ بەستن برەوی پەیدا کرد.

درۆ و قسەی بێ بنەما بە گرنگترین ئامرازی ریا هەژمار دەکرێن. تەقریبەن بەبێ درۆ ناکرێ هیچ ریایەك دروست ببێت و بێتە کایەوە.

کاتێك کەسی ریاکار دەیەوێت بۆشاییەکانی بوونی بشارێتەوە هانا بۆ درۆ و دەلەسە دەبات و بە فێڵ روخسارێکی فریودەر و پەسەند لە خۆی پیشان دەدات.

# کاریگەریی کۆمەڵایەتی
# (مرۆڤی ئاقڵ لەگەڵ رانەمەڕدا باعە باع ناکات)

رۆژێکیان کەسێك لە شەقامێکدا لەناکاو وەستا و لەکاتێکدا کە سەرنجی دەدایە ئاسمان، لێوەکانی دەستیانکرد بە جوڵە. ساتێك دواتر هەندێ لە رێبواران لە پشت سەریەوە وەستان و دەستیانکرد بە تێڕامان لە ئاسمان و پەیتا پەیتا قسە لەسەر ئەوە کرا ئاخۆ ئەبێ چی لە ئاسماندا ببینرێت. قسەی جیاجیا لەبارەی (دەفری فڕیو) و (ئەستێرەی کلکدار)...و ئاڵوگۆڕ کرا. تا ئەوەی کە دواجار کەسی یەکەمیان پژمی و بابەتەکە کۆتایی هات. دەرکەوت کە ئەو کەسە مەبەستی بووە بپژمێت، سەری هەڵبڕیووە و لێوەکانی بۆ ئامادەبوونە بۆ پژمین جوڵەیان تێکەوتووە!

هەڵبەت ئەم چیرۆکە گاڵتە بووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٩دا (ستانلی میلگرام) و هاوکارەکانی لێکۆڵینەوەیەکی راستەقینەی هاوشێوەی ئەم چیرۆکەیان ئەنجامدا. لە جادەیەکی قەرەباڵغی نیویۆرکدا، هاوکارانی لێکۆڵەرەکە لەناکاو وەستان، لە دەوری یەکتری کۆ بوونەوە، سەریان بەرز کردەوە و سەرنجیان دایە پەنجەرەیەکی نهۆمی شەشەمی بینایەیەك. ئەو فیلمانەی کە لە پشت ئەو پەنجەرەیەوە بۆ جادەکە تۆمار کرابوون پیشانی دەدەن کە وەسوەسەی تەماشاکردنی سەرەوە و ئەو پەنجەرەیە کۆنترۆڵنەکراو بوو. تەقریبەن لەسەدا هەشتای رێبواران، کاتێك بینیان کە هەندێك کەس وەستاون و سەرنجیان داوەتە سەرەوە، وەستان و سەرنجیان دایە سەرەوە.

یەکێك لە بابەتە گرنگەکان لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا (کاریگەری و مامەڵەی کۆمەڵایەتی)یە. کاریگەریی کۆمەڵایەتی ئاماژەیە بە چالاکییە راستەوخۆ و بە مەبەستەکان کە بۆ گۆڕینی بیروباوەڕ، تێڕوانین و رەفتارەکان ئەنجام دەدرێت.

کاریگەریی کۆمەڵایەتی پێنج شێوە دەگرێتە خۆی: بەرپێساکردن، یەکڕەنگی، رازیبوون، پەیڕەوی و نوێسازی.

لە چیرۆکەکەی سەرەوەدا ئێمە پێکهاتنی یەکڕەنگی یان هاوئاهەنگییەك بەدی دەکەین. ئایا تاوەکو ئێستا کەوتوویتە حاڵەتێکەوە کە تێڕوانینی تۆ کەوتبێتە بەرانبەر تێڕوانینێك کە خەڵکێکی زۆر لایەنگیری دەکەن. ئایا ترساویت یان پێداگریت لەسەر تێڕوانینی خۆت کردووە؟ چەند جار بووە کە کارێکت ئەنجام داوە و پێوەری راستی و دروستی بڕیارەکەت لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە ئەمە بووە کە هەموویان وەهایان کردووەتەوە؟

حەزی هاتنەپاڵ و قبوڵکردن و لایەنگیری لەلایەن ئەوانیترەوە یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکان کە مرۆڤ ناچار دەکات لەگەڵ کۆمەڵدا ببێتە یەك رەنگ. هەرچەندە بەشێوەیەکی لێبڕاوانە ناتووانین هاوڕەنگی بخەینە ژێر پرسیارەوە، بەڵام زۆرێك لە مەسەلەکانی پەیڕەویکردن لە کۆمەڵ و خۆنەگرتن لەبەرانبەر زۆرینەدا سەرچاوەگرتووی نەبوونی باوەڕ و ئیمانە بە قبوڵکران لەلایەن کۆمەڵەوە. ئەم مەسەلەیە دەبێتە خۆی ئەوەی کە مرۆڤ کاریگەر ببێت و بە لەدەستدانی ئۆتۆنۆمی، ئیرادە تاکەکەسییەکەی لە گروپدا بتوێتەوە و شوناسی خۆی وەکو بوونێکی سەربەخۆ و بیرکەرەوەی جیاواز، لەدەست بدات.

تاقیکردنەوەی زۆر لەلایەن دەروونناسانی کۆمەڵایەتییەوە لەبارەی کاریگەریی کۆمەڵایەتی ئەنجام دراوە کە لەدواییدا ئاماژە بە دوو نموونەی کلاسیك دەکەم کە پەیوەندییان بە هاوڕەنگی و ملکەچی بۆ سەرچاوەی هێزەوە هەیە.

# تا دووەم زانیاری ماست رەشە
# هێزی زۆرینە

سەپاندنی کۆمەڵ دەتوانێ هێزی تێگەیشتن و دیاریکردنمان بخاتەژێر کاریگەرییەوە و ببێتە هۆی ئەوەی نادروستییەکان، بە دروست لەقەڵەم بدەین.

هەمووومان دەزانین ماست سپییە. وایدابنێ لە کۆی هەر ئەم (ئێمە)یەدا، هەمووان رایدەگەیەنن ماست رەشە و پێداگری لە قسەی خۆیان دەکەن. قبوڵکردنی شتێکی وەها دژوارە بەڵام ئەگەر تۆ لەناو کۆمەڵێکی وەهادا بیت چی ئەکەیت؟ ئەم قسەیە پەسەند دەکەیت یان نا. ئایا پێداگری لەسەر قسە و لۆژیکی خۆت دەکەیت لەمەڕ ئەوەی کە ماست سپییە؟ دەچیتە پاڵ کۆمەڵەکە و تۆش دەڵێیت تا زانیاریی دووەم ماست هەر رەشە؟

(سۆلۆن ئێچ)ی دەروونناسی کۆمەڵایەتی بە تاقیکردنەوەیەکی سادە لە دەیەی ٥٠ی زاییندا پیشانیدا کە تا چ ئاستێکی گوشار گروپێك دەتوانێت کاریگەری بخاتە سەر بۆچوونی کەسیی تاکەکان.

ئەو لە تاقیکردنەوەیەکدا سوودی لە ١١٩ خۆبەخش وەرگرت کە بەسەر گروپی حەوت کەسیدا دابەش ببوون. ئەو لەم تاقیکردنەوەیەدا هەموو جارێك دوو کارتی لەبەردەم ئەم بەشداربووانەدا دادەنا. لەسەر کارتی یەکەم هێڵێکی ستوونی کێشرابوو و لەسەر کارتی دووەم سێ هێڵی ستوونی کێشرابوون کە یەکێکیان رێك بە درێژایی هێڵی ستوونیی کارتی یەکەم بوو. دەبێ ئەوان هەموو جارێك هێڵەکە دەستنیشان بکەن. کارەکە زۆر سادە بوو و وەڵامەکەش راست و روون بوو.

سۆلۆمۆن داوای له قوتابییەکان کردبوو بـه دەنگـی بـەرز وەڵامەکـه بڵێن. هەنـدێ جار هەر حەوت کەسەکە بە راست وەڵامیان دەدایەوە و هەندێ جاریش بە هەڵە.

پاش چەند جارێك، پاش ئەوەی کەسـی یەکـەم وەڵامـی هەڵـەی دەدایـەوە ئـەم پرسیارە، زۆربەی کەسە تاقیکراوەکان وەڵامی هەڵەیان بـەم پرسـیارە دەدایـەوە. شتێك کە کەسی حەوتەمی ئەم تاقیکردنەوەیـە نەیـدەزانی ئـەوە بـوو کـە: شـەش کەسی پێش ئەو، بەشێوەیەکی ئەنقەست لەلایـەن سـۆلۆمۆنەوە وەڵامـی هەڵـەیان ئەدایەوە. جێ سەرنجە کە ٧٥٪ی کەسەکان بەرەو وەڵامی هەڵە ئاراستە کرابوون. ئەوەی کە سۆلۆمۆن نەیتوانی روونـی بکاتـەوە ئـەوە بـوو کـە ئایـا بەشـداربووان وێڕای زانینی وەڵامی دروسـت، کەوتنـە ژێـر کاریگـەری کۆمەڵەکـە یـان سـەپاندنی بەکۆمەڵ بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان بە راسـتی هێڵـە هەڵەکـە بـە وەڵامـی راسـت لەقەڵەم بدەن.

ئەم پرسیارە (گریگۆری برنز)ی دەروونناسی زانکۆی ئەتلانتای جولانـد تـا ئـەم تاقیکردنەوەیە دووبـارە بکاتـەوە، بـەڵام بـە جیاوازییـەکی بنچینەییەوە، ئـەویش سوودوەرگرتن لە ئامرازێك کە دەیتوانی لەهەمان کاتدا وێنەی توێژە جیاجیاکانی مێشك بگرێت و چالاکییەکەی بخاتە بەر رۆشنایی.

ئـەمجارەش زۆربـەی بەشـداربووان وەڵامێکـی هاوشـێوەی وەڵامـە هەڵەکـەی کەسانی پێش خۆیان دایەوە و برنز توانی لەکاتی تاقیکردنەوەدا ئەوە ببینێت کە بەشێك لە مێشکی ئەم کەسانەدا کە بەرپرسە لە پـەیبردن بـە دەوروبـەر، چـالاکتر دەبێـت، واتـە ئـەو زانیارییـەی کـە ئێمـە لـەوانیتر وەریـدەگرین دەتـوانێ هێـزی هەستکردن و وەرگرتنمان بگۆڕێت، سەرەنجام ئەو شتەی کە دەیبینین باوەڕی پێ ناکەین.

بەلای برنزەوە، ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەیە لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە زۆر گرنگ بوو. کاتێك پاراستنی دیدی کەسی لەبەرانبەر کۆمەڵدا ئەم سەختی و هەندێ جار نارەحەتییەی لەگەڵدایە، مەترسی ئەوەی کە مرۆڤەکان دیدی خۆیان لەگەڵ دیدی زۆرینەدا بگونجێنن زۆرە، و لەبارێکدا کە دیدی کۆمەڵ توانای ئەوەی هەیە کە هێزی درك و هەستمان بخاتەژێر کاریگەرییەوە، ئەگەری ئەوە هەیە کە چیتر نەتووانین راست لە ناڕاست جیا بکەینەوە.

لە زۆرێك لە بوارەکاندا، ئەم پرسە دەتووانێت زۆر مەترسیدار بێت. لە روانگەی برنزەوە، تاکە رێگای رزگاربوون لەم کێشەیە ئەوەیە کە ئێمە پێداگر بین لەسەر ئەم لێهاتووییەی کاریگەربوونمان لەسەر دەوروبەر و لە کاتی گونجاودا لەبەرانبەر سەپاندنی بەکۆمەڵ بەرەنگاری بکەین.

**(مەهسا حیکمەت)**

# ئەو تاقیکردنەوەیەی کە جیهانی تووشی شۆك کرد پەیڕەوی لە دەسەڵات

تاوەکو ئێستا لەخۆتان پرسیووە هۆی ڕوودانی ئەم هەموو کارەساتە، کۆمەڵکوژی و جەنگانە چییە؟ دەکرێ ئەم کارەساتانە بەبێ هاوکاریی ملیۆنان کەسی کۆمەڵگایەك ڕووبدات؟ ئەرێ دەکرێ تاوانی نازییەکان لە دووەم جەنگی جیهانیدا تەنیا بدرێتە پاڵ هیتلەر و سەرانی نازی؟ ئایا دەکرێ تەنیا سەدام بە هۆکاری هەموو نەگبەتی و کوشتارەکان لەقەڵەم بدەیت کە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوویاندا و پرسیاری ئەوەی نەدەکرد کە ڕۆڵی خەڵکی عیراق لەم میانەدا چی بوو؟ چی ئەبێ کە کەسانی ئاسایی کۆمەڵگەی ئەمریکا لە ڤێتنام و ئەبوغرێب دەبنە دێوەزمە؟

پرسیارێکی وەها فەیلەسوفان و نووسەران و تیۆردانەرانی زۆری بە خۆیەوە قاڵ کردووە. ئەوانیش لەخۆیان پرسیووە ئاخۆ چی ئەبێت کە کۆمەڵگەیەك لە خۆی دادەبڕێت و لەژێر هەلومەرجێکی بێ چەندوچوندا، کاری پێچەوانەی ئاکاری خۆی ئەنجام بدات.

لەوانەیە هیچ کۆمەڵگەیەك ئەوەندەی کۆمەڵگەی ئەڵمانیا لە ساڵان و دەیەکانی پاش کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی وێڵ نەبووبێت بەدوای دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە. نووسەران و ڕۆشنبیرانی وەکو هاینریش بێل، گۆنتەرگراس و ئوڤێ تیم لە بەرهەمەکانی خۆیاندا ئامارەیان بەم پرسە داوە و ویستوویانە بە گێڕانەوەی چیرۆك ئەوەی کە لە سەردەمی باڵادەستی نازییەکاندا بەسەر ئەڵمانەکاندا هاتووە، لێکدانەوەی خۆیان بۆ بابەتەکە بخەنەڕوو.

بەڵام ئەوە تەنیا نووسەران و فەیلەسوفان نین کە گیرۆدەی دۆزینەوەی وەڵامن بۆ ئەم مەتەڵە شیکار نەکراوە، لەوانەیە دەروونناسان گونجاوترین بیرمەند بن بۆ تاووتوێکردنی ئەم بابەتە.

لێرەدا، تاقیکردنەوەیەك باس دەکەم کە لە دەیەی ٦٠ی زاییندا لەلایەن ستانلی میلگرام–دەروونناسی کۆمەڵایەتی بەناوبانگ– ئەنجامدرا کە بە تاقیکردنەوەی میلگرام ناسراوە.

## تاقیکردنەوەی میلگرام

تاقیکردنەوەی میلگرام، تاقیکردنەوەیەکی دەروونناسی کۆمەڵایەتییە کە لەلایەن ستانلی میلگرام ئەنجام درا. ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوە گەڵاڵە کرا کە حەزی بەشداربووان لە تاقیکردنەوەی پەیڕەویکردن لە دەسەڵات و ئەنجامدانی کاری پێچەوانەی حەز و ئاکاریان هەڵبسەنگێنێت.

ئەنجامەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە، یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٣دا لە گۆڤارێکی دەروونناسیدا چاپ کرا و دواتر لە ساڵی ١٩٧٧دا بە وردەکاریی زیاترەوە لە کتێبێکدا بەناونیشانی (پەیڕەوی لە خاوەن دەسەڵاتەکان لە روانگەی تاقیکردنەوەوە) چاپ کرا.

ئەم تاقیکردنەوەیە لە تەموزی ساڵی ١٩٦١دا، رێك سێ مانگ پاش دەستپێکردنی دادگای ئایشمەن– تاوانباری نازی– ئەنجام درا. میلگرام دەیویست وەڵامی ئەم پرسیارە سەختەی ئەو ساڵانە وەڵام بداتەوە: ئایا ئایشمەن و ملیۆنان ئەڵمانی تر تەنیا پەیڕەوییان لە فەرمان دەکرد ئایا دەتوانین ئەوان بە هاودەستی ئەم کردەوە تاوانکارییە لەقەڵەم بدەین؟ چۆن چۆنی هاوڵاتییەکی ئاسایی تەنیا بە پەیڕەویکردن لە فەرمانەکانی سەرەوەی ببێتە بوونەوەرێکی جیاواز؟

**شێوازی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکە:**

ئەو کەسانەی کە دەبوونە خۆبەخشی تاقیکردنەوەی میلگرام پێیان دەوترا ئامانج لەم تاقیکردنەوەیە، لێکۆڵینەوەیە لەبارەی یادەوەری و فێربوون لە هەلومەرجی جیاوازدا و لەبارەی ئامانجی راستەقینەی تاقیکردنەوەکەوە هیچیان پێ نەدەوترا.

کەسی خۆبەخش دەبرایە ژوورێك کە تیایدا کەسێك هەبوو کە خۆی وەکو زانای لێکۆڵەر دەناساند. ژوورێکی تر کە بە دیوارێکی بەربەست لەو ژوورە جیا دەبووەوە کەسێکی تر هەبوو (فێرخواز) کە وا دەردەخرا کەسێکە کە تاقیکردنەوەی پەیوەست بە فێربوون لەسەری لە حاڵەتی جێبەجێکردندایە.

شێوازی ئەنجامدانی بە جۆرێك بوو کە بکەری سەرەکی تاقیکردنەوەکە دەبووایە زنجیرەیەك وشەی جوتی لەسەر کاغەز دەخوێندەوە بۆ نموونە: دیوار-باڵندە، پەمەیی-دوێنێ، زانین-ئاو. پاشان دەبووایە بکەری تاقیکردنەوەکە یادەوەریی فێرخوازەکەی بە وتنی وشەی یەکەمی هەر جوت وشەیەك تاقی بکردایەتەوە و داوای لە فێرخوازەکە دەکرد لەنێوان چوار هەڵبژاردندا، جوتە راستەکە هەڵبژێرێت. بۆ نموونە، دەبووایە پاش بیستنی وشەی زانین، بڵێت: ئاو.

لەبارێکدا کە فێرخواز وەڵامی نادروستی ئەدایەوە، بکەرەکە ئەوەی لەسەر بوو بە پەنجەنان بە دوگمەیەکدا شۆکی کارەبایی لە فێرخوازەکە بدات و ئەگەر هەڵەی فێرخوازەکە دووبارە بووایەتەوە، دەبووایە بکەرەکە ١٥ ڤۆڵت بۆ شۆکە کارەباییەکە زیاد بکات و ئەم کارە هەروا بەردەوام دەبوو!

هەڵبەت لەم تاقیکردنەوەیەدا بە راستی شۆکی کارەبایی بوونی نەبوو! لە پێشدا دەنگی ناڵەی گونجاوی پەیوەندیدار بە هەر پلەیەکی شۆکەوە تۆمار کرابوو

و هاوکات لەگەڵ هەر شۆکێکدا کە مامۆستا ئەیگەیاند، دەنگێکی گونجاو لەگەڵ پلەی شۆکەکە پەخش دەکرا.

بۆ دراماتیك کردنی ئەم تاقیکردنەوەیە پێش دەستپێکردنی تاقیکردنەوەکە بە بکەرەکە دەوترا فێرخوازەکە دڵی تەواو نییە! وێڕای ئەمە کاتێك پلەی شۆکەکە زۆر زیاد دەکرا، ئەو کەسەی کە رۆڵی فێرخوازی دەبینی دەبووایە خۆی بکوتایە بە دیواری بەربەستی نێوان ژووری بکەرەکە و خۆیدا و لەکاتێکدا کە پلەی شۆکەکە بەردەوام دەبوو، بۆ نواندنی نارەحەتی توندی کەسی فێرخواز، هەموو دەنگەکان دەبڕدران!

ئاشکرایە کە کاتێك زۆرێك لە بەشدارەکان کاتێك پلەی شۆکی بەرز دەبووەوە، نیگەران دەبوون. هەندێکیشان کاتێك شۆکەکە دەگەیشتە ١٣٥ ڤۆڵت، کارەکەی دەوەستاند و لەبارەی ئامانجی تاقیکردنەوەکە پرسیاریان دەکرد، بەڵام کاتێك پێیان دەوترا هیچ بەرپرسیارێتییان ناکەوێتە ئەستۆ، زۆربەیان لە کارەکەیان بەردەوام دەبوون! ژمارەیەکی کەمیش کاتێك گوێبیستی دەنگیناڵەی فێرخوازەکان دەبوون، بزەیەکی ساردیان دەکرد و نیشانەی کرژبوونیان لەخۆیان دەخستەڕوو.

ئەگەر بکەرەکان بیانویستایە دەست لە کار بکێشنەوە، رستەی لەم جۆرەیان پێ ئەوترا: تکایە بەردەوام بن– تاقیکردنەوە پێویستی بە نەوەستانی تۆیە– تۆ هەڵبژاردنی ترت نییە و دەبێ بەردەوام بیت– زۆر پێویستە بەردەوام بیت.

لەکاتێکدا کە بەو هەموو جەختکردنەوەیە دیسان بکەرەکان هەوڵیان ئەدا کارەکە بوەستێنن، تاقیکردنەوەکە دەوەستا. بە پێچەوانەوە تا گەیشتنی ڤۆڵتێیەکە بە ٤٥٠ ڤۆڵت، تاقیکردنەوەکە درێژەی پێ دەدرا.

## ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەی میلگرام:

پـێش ئەنجامـدانی تاقیکردنەوەکـە، میلگـرامیش بۆچـوونی فێرخوازەمـان و هاوکارانیشـی وەرگـرت و داوای لێکـردن پێشـبینی بکـەن چ ڕێژەیـەکی سـەدیی کەسانی تاقیکراوە دەگەنە ئاستی شۆکە گەورە و مەترسیدارەکان، زۆرینـەی ئـەو کەسانەی کە داوای بۆچوونیان کرابوو بڕوایان وابوو کە کەسانێکی زۆر کەم ئامادە دەبن شۆکی پلە بەرز ئاراستە بکەن. لەوانەیـە تـۆش ئەگـەر جـاری یەکـەم باسـی تاقیکردنەوەیەکی وەهات ببیستایە، هەمان بۆچوونت هەبووایە.

بـەڵام جێـی سەرسـوڕمانە کـە ٢٤ کـەس لـە ٤٠ کەسـی تـاقیکراوە واتـە ٦٥٪ی بکەرەکان، گەیشتنە شۆکی بەرزی ٤٥٠ ڤۆڵتی! تەنیا یەك بەشدار پـێش گەیشتن بە پلەی شۆکی ٣٠٠ ڤۆڵت تاقیکردنەوەکەی وەستاند. هەڵبەت ژمارەیەکی زۆریـان بەشێوەیەکی کـاتی تاقیکردنەوەکـەیان وەسـتاند و تەنانـەت باسـی گەڕاندنـەوەی بڕەپارەیەکیان کرد کە بۆ بەشداریکردن لە تاقیکردنەوەدا پێیان درابوو، بـەڵام لـە کرداردا زۆربەیان درێژەیان بە کاری خۆیاندا.

لەوانەیە پێت وابێت کە تاقیکردنەوەیەك شتێکی وەها ناسەلمێنێت، بـەڵام دوای ماوەیەك میلگرام ئەم تاقیکردنەوەیەی بە جیاوازییـەکی کـەم ئەنجامـدا و گەیشـتە هەمان ئەو ئەنجامانە. شیکردنەوەیەك کە لەلایەن هاوکـارێکی میلگرامـەوە ئـەنجام درا، دەریخسـت کـە ڕێـژەی ئـەو تاکەکەسـانەی کـە گەیشـتنە شـۆکی پلـە بـەرز، تەقریبەن جێگیر و لە دەوری ٦١ تا ٦٦دا بوو.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە لەم زنجیرە تاقیکردنەوانەدا ئـەوە بـوو کـە هـیچ کـام لـە بەشـدارەکان، تەنانـەت ئەوانـەش کـە تاقیکردنەوەکـەیان جـێ هێشـت، هـیچ پێداگرییەك یان پێشنیارێکیان بۆ وەستاندنی خودی تاقیکردنەوەکە نەخستەڕوو و

سەرباری ئەمەش هیچ کام لەوان ژوورەکەیان بۆ کۆنترۆڵکردنی سەلامەتی فێرخواز جێ نەهێشت!

ئەنجامەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە مشتومڕی زۆری لێکەوتەوە، ڕۆژنامەیەک نوسیبووی تاقیکردنەوەی میلگرام پیشانیدا چ مەترسییەک لە بۆسەی سروشتی مرۆڤدایە.

## ڕاڤەی تاقیکردنەوەکەی میلگرام:

دوو تیۆرە لەبارەی ئەم تاقیکردنەوەیە گەڵاڵە کراون:

١-تیۆرەی یەکڕەنگی لەگەڵ کۆمەڵدا: ئەو کەسانەی کە دەسەڵات و توانای بڕیاردانیان نییە بەتایبەت لە بارودۆخی قەیراناویدا. لە هەلومەرجی دژواردا بڕیاردان بۆ کۆمەڵگە و سیستەمی هیرارکی دەسەڵات جێ دەهێڵن.

٢-دەکرێ تیۆرەی دووەم زۆر بە ئاسانی بە تیۆرەی کارمەندی لێبوردراو ناو ببردرێت!: لەم تیۆرەیەدا تاکەکانی کۆمەڵگە خۆیان بە تاکە ئامراز بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرەوە دەزانن و خۆیان بە بەرپرسی کارەکانی خۆیان نازانن.

## د: چیرۆکەکانی کەمیی باوەڕبەخۆبوون و کاریگەربوون:
## چیرۆکی جوتیار و شانس
## (شوێنی کۆنترۆڵتان دەرەکییە یان ناوەکی؟)

یەکێك لە بابەتە گرنگەکان، شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ هەلومەرجی سەخت و بارودۆخە دژوارەکانی ژیاندا. لەم بوارەشدا تاکەکەسە کاریگەرەکان تێڕوانین و پەرچەکرداری جیاوازیان هەیە کە بە سوودوەرگرتن لە دوو تیۆرەی کۆنترۆڵ و دەستەوستانیی فێرکراو، دەپرژێمە سەری.

جوتیارێك کە بۆ درەوکردنی عەلەف چووبووە کێڵگەکەی، پاش کەمێك ئیشکردن هەستی بە بێتاقەتی کرد و لە سوچێك ڕاکشا و خەوت. هەر لەو کاتەدا (شانس) کە بەو ناوەدا ڕەت دەبوو و ئەوی بینی، چووە سەر سەری جوتیارەکە و وتی: ئای لەوە ! کاتی ئیشکردن خەوتووە. ئاسمان هەورییە و بەم زووانە باران دەبارێت و ئەو بە خەوتن ناتوانێت پێش بارین عەلەفەکە درەو بکات و بیباتە کۆگا. ئەو کاتە هەموو لۆمەی دەخاتە ملی من و دەڵێت ئەمە لە شانسی خراپی منە کە کارەکانم ماون. نەفرەت لەم شانسە.

**سەرنج:** جولیان راتەری دەروونناس بۆ یەکەمین جار زاراوەی ناوەند یان شوێنی کۆنترۆڵی بەکارهێناوە.

ئەو تاکەکانی کردبووە دوو گروپ:

١-کۆنترۆڵی ناوەکییەکان: ئەو کەسانەی کە سەرکەوتن یان شکستەکانی خۆیان دەدەن پاڵ خۆیان.

ئەوان پێیان وایە بەرپرسی ژیانی خۆیانن و چۆنایەتی ژیان پەیوەستە بە هەڵبژاردنەکان و هەوڵەکانیان.

دروشمی ئەوان ئەمەیە: خەتای ئێمەیە نەك چارەنووسی ئێمە.

٢-کۆنترۆڵی دەرەکییەکان: ئەو کەسانەی کە هۆکاری سەرکەوتن و شکستەکانی خۆیان دەخەنە پاڵ هۆکارە دەرەکییەکانی وەکو شانس، چارەنووس و سەختیی هەلومەرجەکان.

تاکەکەس بە کۆنترۆڵکردنی دەرەکی دەیەوێ کۆنترۆڵی رەفتارەکانی بداتە پاڵ ئەو هێزانەی کە لە دەرەوەی توانا و ئیرادەی دان. ئەو بە پێچەوانەی کۆنترۆڵی دەرەکییەکان بڕوای وایە ئێمە کۆنترۆڵمان بەسەر چارەنووسی خۆماندا نییە.

ئێستا ئەم پرسیارە لە گۆڕێیە، ئایا ناوەندی کۆنترۆڵی تۆ دەرەکییە یان ناوەکی؟

# کۆنترۆڵی دەرەکی و ناوەکی

باوەڕبوون بە کۆنترۆڵی ناوەکی لەناو ئەو خێزانانەدا ئاراستە دەکرێت کە تیایدا دایك و باوکان دڵسۆز و پشتیوانی منالآنن و هەوڵ نادەن کۆنترۆڵێکی تاکڕەوانەیان بکەن. هەروەها دایك و باوك لە شێوازی پەروەردەکردنی منالآندا رەفتاریان جێگیرە.

لە قۆناغی دووەمی منالێدا گۆڕان لە حالەتی پشتیوانییەوە دەگۆڕێت بۆ بەخشینی سەربەخۆیی بە منالّ. سەرباری ئەمەش، دایکان زۆر کەمتر پەیوەندی لەگەلّ منالەکانی خۆیاندا دروست دەکەن.

هەستکردن بە خۆژێنی و پشت بەخۆبەستن لە تەمەنی زانکۆییدا تا تەمەنی گەورەیی پەرە دەسێنێت.

### کۆنترۆڵی ناوەکی، دەرەکی و لێهاتوویی کرداری:

توێژینەوە جۆراوجۆرەکان دەریانخستووە کەسانی خاوەن کۆنترۆڵی ناوەکیش هەم لە بارودۆخی تاقیگەییدا و هەم لە بارودۆخی وانەییدا، لەرووی کردارییەوە زۆر باشن.

### گوزارشتی هەمەکی ئەم ئەنجامانە:

کۆنترۆڵە ناوەکییەکان لەرووی مەعریفەییەوە تۆکمەتر، چالاکتر و نەرمتر و لە فێربووندا لێهاتووترە. بەدوای بەدەستهێنانی زیاتری زانیاریدا وێڵن. لەگەلّ بارودۆخی خۆیاندا گونجاوتر دەبن و دەرەنجامەکان کۆنترۆڵ دەکەن.

## کۆنترۆڵی ناوەکی و دەرەکی و شارەزایەتییە کۆمەڵایەتییەکان:

کۆنترۆڵە ناوەکییەکان توانای زیاتریان هەیە لە حەلکردنی پرسیارەکانی ژیان و بە بەراورد بە کۆنترۆڵی دەرەکییەکان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بە گونجاوتر هەژمار دەکرێن. ئەگەر مامەڵەی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووتریان هەبێت، نیازمەندی ئاڵوگۆڕی زانیاریی و هاوبەشیکاری ئەزموونەکان بن، ئاشکرایە کە کۆنترۆڵە دەروونییەکان لە هەلومەرجی باشتر و بە شارەزایەتییەکی کۆمەڵایەتی بەرزتر وەڵامگۆن.

## کۆنترۆڵی دەرەکی و ناوەکی و ئاستی وەرگرتنی هاندان:

کۆنترۆڵی ناوەکییەکان حەز دەکەن بەشێویەکی سەربەخۆ حوکم بدەن و لەژێر کاریگەری ئەوانیتر نەبن لەکاتێکدا کە کۆنترۆڵە دەرەکییەکان لە بارودۆخی هاوشێوەدا زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری ئەوانیترەوە.

تاکەکان بە گرتنەبەری کۆنترۆڵی ناوەکی نەک تەنیا حەز دەکەن لەبەرانبەر کاریگەریی ئەوانیتردا بەرەنگاری بکەن، بەڵکو کاتێک دەرفەتێکیان بۆ هەڵدەکەوێت هەوڵێکی زیاتر دەدەن تا رەفتاری ئەوانیتر کۆنترۆڵ بکەن. سەرباری ئەمەش، ئەوان ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت کە رێگە بدەن بەسەریاندا زاڵ بن و ئەو کەسانەیان خۆش ناوێت کە ئەم دەرفەتە نارەخسێنن.

## کۆنترۆڵی ناوەکی و دەرەکی و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی:

ئیرادە و حەزی باڵاتر بوون لە ئەنجامدانی کارەکاندا، بەندە بەوەی کە تاکەکان چ هەڵسەنگاندنێکیان بۆ ئەزموونەکانی سەرکەوتن و شکستی خۆیان هەیە.

کۆنترۆڵی ناوەکییەکان سەرکەوتن دەبەستنەوە بە هۆکارە ناوەکییەکان (توانا و هەوڵدان) لەبەرانبەردا ئەو کەسانەی کۆنترۆڵی دەرەکییان هەیە دەیبەستنەوە بە (شانس یان قورسبوونی ئەرکەکە). سەرەنجام، کۆنترۆڵی ناوەکییەکان بە بەراورد بە کۆنترۆڵی دەرەکییەکان ئەزموونی لوتبەرزانەیٚ زیاتریان هەیە و لە ئەنجامدانی ئەرکەکاندا زیاتر پێداگری دەکەن.

## کۆنترۆڵی ناوەکی و دەرەکی و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی:

کۆنترۆڵی ناوەکییەکان بە بەراورد بە کۆنترۆڵە دەرەکییەکان شکست دەبەستنەوە بە هۆکارە ناوەکییەکان. بۆیە ئەگەر کۆنترۆڵە ناوەکییەکان نەتوانن کێشەی خۆیان لەناو ببەن ئەوا هەست بە گوناه و شەرمەزاریی زیاتر دەکەن. بەڵام کۆنترۆڵی دەرەکییەکان حەزیان لە بەکەم لەقەڵەمدانی ئەو تاقیکردنەوانەیە کە تیایاندا شکست دێنن.

کۆنترۆڵی ناوەکییەکان نەك تەنیا بەپرسیارێتی کارەکانی خۆیان هەڵدەگرن بەڵکو بڕوایان وایە دەبێ ئەوانیتریش بەرپرسیاری کار و کردەوەی خۆیان بن.

## کۆنترۆڵی ناوەکی و دەرەکی و سەلامەتی جەستەیی:

کەسەکان بە کۆنترۆڵکردنی ناوەکی، لە رووی جەستەییەوە لە کەسانی کۆنترۆڵی دەرەکی تەندروستترن.

کۆنترۆڵە ناوەکییەکان لە قۆناغی منداڵیدا زیاتر لە کەسانی کۆنترۆڵی دەرەکی، لە رێگەی دایك و باوك بەرەو رەچاوکردنی بەرنامەی خۆراکیی گونجاو، ئەنجامدانی وەرزشی پێویست و دەم و دان شتن هان دەدرێن. لە ئەنجامدا کۆنترۆڵە ناوەکیەکان خۆیان بە بەرپرسی سەلامەتی جەستەیی خۆیان دەزانن.

نەخۆشەکانی کۆنترۆڵی ناوەکی بە بەراورد بە کۆنترۆڵە دەرەکییەکان زانیاری زیاتریان لەبارەی نەخۆشی خۆیان لە پزیشك و ...بەدەست دەهێنن. کۆنترۆڵە ناوەکییەکان حەزی زیاتریان لە وازهێنان لە جگەرە، چالاکییە جوڵەییەکان و وەرزشە.

## کۆنترۆڵە ناوەکی و دەرەکییەکان و سەلامەتی دەروونی:

توێژینەوەکان دەریدەخەن کە کۆنترۆڵە ناوەکییەکان لەرووی دەروونییەوە لە کۆنترۆڵە دەرەکییەکان ساغترن. خەمۆکێکان، شیزۆفرینییەکان و نەخۆشە عەسەبییەکان زیاتر کۆنترۆڵی دەرەکین نەك ناوەکی.

ئەگەرچی کۆنترۆڵە ناوەکییەکان بە بەراورد بە کۆنترۆڵە دەرەکییەکان لە هەندێ رووەوە زیاتر گونجاون لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کۆت و بەندیان لەبەردەمدایە. لەوانەیە کۆنترۆڵە ناوەکییە توندەکان نەگونجاوتر بن. بەجۆرێك کە خۆیان و ئەوانیتر لە رێگەی شەڕانگێزی و شێوازە دەسەڵاتخوازییەکانی خۆیانەوە بە توندی دەخەنە ژێر کۆنترۆڵەوە. هەروەها ئەگەری وەسواس بوون لەم کەسانەدا زۆرە.

به هەولّی خۆت ناتوانیت پەی بە گەوهەری
خوازراو ببەیت.

(حافز)

# دستەوستانی فێرکراو

یەکێك لەو هۆکارانەی کە مرۆڤ دەگاتە حاڵەتی هەڵچوون و کارتێکران کۆمەڵێك نائومێدیو ئەزموونی تاڵی شکستە کە لە زەینیدا کەڵەکە بوون.

ئەو هەلومەرجەی کە تیایدا تاکەکەس بەپێی ئەزموونەکانی رابردوو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە رووداوی ناخۆش روودەدات بەڵام بۆ بەرگرتن لەو رووداوە ناتوانێت هیچ بکات، دەرەنجامی باوەڕ، ناچالاکی، کەموکوڕی زانین و نیشانەی ترە کە لەگەڵ خەمۆکێدا هاوشێوەن.

لەبەرئەوەی دەستەوستانی فێرکراو ئاماژەیە بەو باوەڕەی کە تاکەکەس ناتوانێت رووداوەکان بەڕێوە ببات، لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ پێگەی کۆنترۆڵی دەرەکیدا هەیە.

لەم هەلومەرجەدا ئەو خۆی یەکلایی کردووەتەوە و لە رێگەی ئەم رووداوە ناخۆشانەوە فێری دەستەوستانی دەبێت.

ئەم بابەتەی کە دەرەنجامەکانی رەفتارە سەربەخۆکان لە رەفتاری تاکەکەسن، سەرەتا لەلایەن مارتین سلیگمەن تاووتوێ کرا.

سلیگمەن چەمکی دەستەوستانی فێرکراو وەکو حاڵەتێکی تایبەت پێناسە کرد کە زۆرجار دەرەنجامی بیروباوەڕی تاکەکەسە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە رووداوەکان لە دەسەلاتی ئەودا نین.

بە دەربڕینێکی تر، پاش رستێك ئەزموونی کە تیایدا وەڵامەکانی تاکەکەس لەئەنجامی رەفتارەکەیدا ناگۆڕێت، ئەوە فێر دەبێت کە رەفتار و ئەنجامی رەفتارەکەی جیان لە یەکتری. لە تاقیکردنەوە بەراییەکانی پەیوەست بە دەستەوستانی فێرکراو، ئەو سەگانەی کە کەوتبوونە بەر شۆکی کارەبایی حەتمی، فێری ئەوە بوون کە هیچ کام لە وەڵامەکانیان، لەوانەش کلك راوەشاندن، وەڕین، بە رێگەدا رۆیشتن، بازدان و هیتر نابێتە هۆی بڕینی شۆکە کارەباییەکە؟

پاشان کاتێك ئەم سەگانە خرانە ناو بارودۆخێکەوە کە تیایدا دانانی کۆسپێك دەبێتە هۆی بڕینی شۆکە کارەباییەکە، لە سەرەتا سەگەکان بەملاولادا رۆیشتن پاشان راکشان و بەشێوەیەکی ناچالاك خۆیان بە شۆکەکە سپارد.

بە دەربڕینێکی تر ئاژەڵەکان پاش ئەزموونکردنی شۆکە کنترۆڵنەکراوەکە، پاڵنەری وەڵامدانەوەیان لەدەستدا و دڵەڕاوکێ و شڵەژان شوێنی گرتەوە.

وێڕای ئەمە تەنانەت ئەگەر یەکێك لەو کاردانەوانە لە نەهێشتنی کێشەکەدا سەرکەوتوو نەبووایە، ئاژەڵەکە لە فێربوونی ئەوەی کە ئەو کاردانەوەیە کاریگەرە، دەستەوستان بوو. توێژینەوەی دواتر لەگەڵ مرۆڤەکاندا، ئەنجامەکانی سەرەوەی پشتڕاستکردەوە.

توێژینەوەی تر لەم بوارەدا ئاماژە دەدات بە کاریگەری بێ ئاکامی رەفتاری (ماسی مراوی)یەك. ماسییە مراوییەکیان خستە ناو حەوزێکی شوشەوە کە ژمارەیەکی زۆری سورە ماسی لە دەوروبەریدا مەلەیان دەکرد. کاتێك ماسی مراوییەکە لەگەڵ فرەیی خۆراکی دەوروبەری راهات، بەربەستێکی شوشەییان لەنێوان ئەم و ماسییەکانی دەوروبەریدا دانا. کاتێك ماسی مراوییکە برسی بوو هەوڵیدا خۆی بگەیەنێتە سورەماسییەکان. بەڵام بەردەوام سەری بەر بەربەستە شووشەکە دەکەوت. سەرەتا برسێتییەکەی زیادیکرد و ماسییە مراوییەکە زیاتر لە

پێشوو هەوڵیدا خۆی بگەیەنێتە سورەماسییەکان. بەڵام دواجار، شکستی دووبارە لە گەیشتن بە ئامانج، بایی پێویست بووە هۆی نائومێدبوونی بە جۆرێك کە چیتر هەوڵی نەدا. لە راستیدا کاتێك بەربەستە شوشەکەیان لابرد و سورەماسییەکان دووبارە لە دەورووبەریدا کەوتنەوە مەلەکردن، ئیتر هیچ جوڵەیەکی بە ئامانج لەلایەن ماسییە مراوییەکەوە ئەنجام نەدرا. دواجار، ماسی مراوییەکە لەکاتێکدا کەلەناو ئەو هەموو خۆراکەدا بوو لە برسێتیدا مرد.

**(غولامڕەزا ئاتەشدامەن)**

گەر تـوڕەیی، شـێتی و ئـارامگرتن ئـاقڵی بێـت
بۆچـی هەرکەسـێك بتـوانێ ئاقـڵ بێـت شـێت
ئەبێت؟

(سائیب تەبریزی)

# دەرمانی مشتەکۆڵە

کوێخای گوند وتی: ئەگەر لەگەڵ براکەتدا بـوو بـە شـەڕت و ویسـتت بیکوژیـت، سەرەتا دانیشە و مشتەکۆڵەکەت ئامادە بکە.

مشتەکۆڵەی یەکەمت کە ئامادە بوو، بۆت دەردەکەوێت کە بە گشتی مـەرگ بـۆ هەڵـەی ئەنجامـدراو سـزایەکی قورسـە و بـاوەڕ بـە خـۆت دەهێنیـت تـەنیا بـە دار بکەویتە گیانی.

ئینجـا مشـتەکۆڵەی دووەم ئامـادە بکـە و تـەواوی بکـە. پاشـان بـیر لـەوە دەکەیتەوە کە لەبری لێدان وا باشترە کە ململانێیەکی باشی لەگەڵ بکەیت.

ئێستا مشتەکۆڵەی سێیەم ئامادە دەکەیت. کاتێك کە تەواوت کرد، دەچیتە لای براکەت و لەبری ململانێ، ئەیگریتە باوەش!

کابرای هەڵچوو لە هەموو شوێنێك بەدی دەكرێت

لە هیچ بوارێكدا كەسی بەئۆقرەم نەبینیووە

(سائیب تەبریزی)

# بەلەمی بەتاڵ

كاتێك گەنج بووم زۆر حەزم لە بەلەم سواری بوو. بەلەمێكی بچوكم هەبوو كە لە دەریاچەدا بەلەم سواریم ئەنجام دەدا و كاتێكی زۆرم لەوێ بە تەنیا بەسەر دەبرد.

شەوێك بێ ئەوەی كە بیر لە شتێكی تایبەت بكەمەوە دانیشتم و چاوەكانم داخست. شەوێكی زۆر جوان بوو. هەر لەو كاتەدا بەلەمێكی تر بەر بەلەمەكەی من كەوت. تورە بووم و ویستم لەگەڵ ئەو كەسەدا بیكەمە شەڕ كە بە پیاكێشان بە بەلەمەكەی مندا ئارامی لێ تێكدابووم، بەڵام سەیرم كرد بەلەمەكە بەتاڵە.

كەس لەناو بەلەمەكەدا نەبوو كە شەڕی لەگەڵ بكەم و تورەیی خۆمی بەسەردا هەڵڕێژم. چۆن دەمتووانی تورەیی خۆم بەتاڵ بكەمەوە. چۆن دەمتووانی تورەیی خۆم بەتاڵ بكەمەوە؟ هیچم پێ نەدەكرا. دووبارە دانیشتم و چاوەكانم داخست، تورە بووم....لە كپی شەودا كەمێك بیرم كردەوەوە، بەلەمە بەتاڵەكە بۆ من بووە دەرسێك...

لەوە بەدوا، ئەگەر كەسێك ببێتە هۆی تورە بوونم، لەبەر خۆمەوە دەڵێم: (ئەم بەلەمە بەتاڵە!)

**سەرنج:**

لە راستیدا ئەو كەسەی كە تۆ تورە دەكات، دەروازەكانی تۆی كردووەتەوە. ئەگەر رێگە بە خۆت بدەیت لە كەسێك تورە بیت و بەشێكی گەورەی سۆز و ئەقڵتی بۆ تەرخان بكەیت، رێگەشت پێداوە ببێتە خاوەنی ئەو بەشانەی بوونت...

گەر لەبەر هەر بایەك وەكو گەڵا بلەرزێت
ببیتە شـــــــاخیش پوشێك ناهێنێت
(شێخ بەهایی)

## ...كە لە تەریقەتی ئێمەدا رەنجان كافرێتییە

گەنجێكی خێزانێكی دەوڵەمەند بۆ بەدەستهێنانی زانین و بڕینی قۆناغەكانی تەریقەت چووە لای مامۆستای گەورە. مامۆستا بۆی باسی سەختی رێگا و ململانێ كرد. بەڵام گەنجەكە سوور بوو لەسەر ئەوەی مامۆستا بیكاتە قوتابی خۆی. لە كۆتاییدا مامۆستا بەشێوەیەكی مەرجدار قبوڵی كرد. وا بڕیار بوو كە گەنجەكە بە تەواوی خۆی بە دەستی مامۆستا بسپێرێت و مل بۆ هەر تاقیكردنەوە و ئەركێك بدات كە مامۆستا بۆی دیاری دەكات.

مامۆستا بەرپرسیارێتی پاك و خاوێنی پەرستگاكەی خستە ئەستۆی ئەو. كەسێك كە تا دوێنێ لە خۆشگوزەرانیترین هەلومەرجدا دەژیا دەبووایە بپرژێتە سەر پاكڕاگرتنی ژوورەكان و بردنی خۆڵ بۆ دەرەوە. چەند مانگێك بەم شێوەیە تێپەڕی تا ئەوەی كە قوتابییە كۆنەكان بە لەبەرچاوگرتنی گۆڕانكارییەكانی گەنجەكە، داوایان لە مامۆستا كرد دەست بكات بە فێركردنی، بەڵام مامۆستا هیچ پەلەی بۆ ئەم كارە نەبوو.

ڕۆژێكیان، كاتێك گەنجەكە خەریكی گواستنەوەی زبڵ بوو خۆی كێشا بە كەسێكدا كە نەیبینیبوو و هەموو خۆڵەكەی لێ ڕژایە سەر زەوی.

گەنجەكە توڕە بوو و بە كابرای وت: (ئەگەر پێش هاتنم بۆ پەرستگا ئاوا بەر من بكەوتیتایە ئەوا حەتمەن ڕووبەڕووی سزایەكی قورس دەبوویتەوە و لەكاتێكدا

كە هەوڵی ئەدا دان بەخۆیدا بگرێت، دەستیکرد بە کۆکردنەوەی زبڵەکە). ئەم کەسە لەلایەن مامۆستاوە نێردرابوو بۆئەوەی تاقی بکاتەوە. مامۆستا دوای ئەوەی بەسەرهاتەکەی بیستەوە وتی: (ئەو هێشتا ئامادەیی تیا نییە..هێشتا لە کۆت و بەندی رابردوودایە...)

ماوەیەك تێپەڕی و ئەم رووداوە دیسان دووبارە بووەوە: دووبارە شێوازێکی تورە و هەڕەشەئامێزی بەکار هێنا. بۆچوونی مامۆستا ئەوە بوو کە ئەو هێشتا ئامادە نەبووە. لە سێیەمین جاردا، قوتابییەکە لەسەرخۆ دەستیکرد بە کۆکردنەوەی خۆڵەکە و بە نەرمی مامەڵەی لەگەڵ کابرای بەهەڵەداچوو کرد. مامۆستا دوای گوێبیستبوونی بەسەرهاتەکە بە قوتابییەکانی تری وت: (ئەو ئامادەیە بۆ وەرگرتنی وانەکان. بانگی بکەن با بێت).

### بەڕێوەبردنی هەڵپەی هەستەکان، مەرجی سۆفیگەری

لە شێخ ئەبولسەعید ئەبولخەیریان پرسی: (سۆفیگەری چییە؟)

شێخ لە وەڵامدا وتی: ئەوەی لەسەرتایە لێی تێپەڕیت

ئەوەی لە دەستتایە ببەخشیت

ئەوەی بەسەرتا دێت، خۆی لەبەرانبەر بگریت.

ئارامگرتن تاڵە بەڵام بەری شیرینە

(سەعدی)

# ئارامگرتن و دان بەخۆدا گرتن
# واتە نەکەوتنە ژێر کاریگەری

(صابر) مامۆستایەکی گەنج بوو کە خۆی بۆ وانەوتنەوە لە شارێکی بچوك و دوورەدەستدا ئامادە دەکرد. ئەو لە رۆژانی دوایی مانەوەیدا لە شارەکە، چووە لای یەکێك لە هاوڕێکانی مامۆستاکەی تاوەکو داوای رێنمایی لێ بکات. هاوڕێی صابر پێی وت: (گرنگترین تایبەتمەندی کە مامۆستایەکی باش هەیبێت دان بەخۆداگرتن و ئارامییە لەکاتی وانە وتنەوەدا).

ئەوان چەند خولەکێك پێکەوە قسەیان کرد بەڵام هاوڕێکەی صابر دێڕێکی قسەکانی دووبارە کردەوە: (گرنگترین تایبەتمەندیی مامۆستا ئارامگرتنە). ئەم مەسەلەیە بووەهۆی تورەبوونی صابر بەجۆرێك کە بە تورەییەوە بە هاوڕێکەی وت: (من فێر بووم کە گرنگترین تایبەتمەندی کە دەبێ لەخۆمدا بیهێنمەکایەوە ئارامگرتنە. بەڵام تۆ بە دووبارەکردنەوەی ئەو دێرە تورەم دەکەیت.

هاورێکەی صابر لەکاتێکدا کە دەستی لە شانەکانی دەدا وتی: بەڵام دەزانی بۆچی کاری پێناکەیت؟ لەنێوان زانست و کرداردا مەودایەکی زۆر هەیە و زانستێك کە نەبێتە کردار هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ نەزانیدا نییە، هەروەکو چۆن کەسێك کە خوێندەوارە و ناخوێنێتەوە لەگەڵ کەسێکی نەخوێندەوار جیاوازی نییە.

**سەرنج:** کەسی دەوڵەمەندیش کە سوود لە سامانەکەی وەرناگرێت جیاوازی نییە لەگەڵ کەسێکی هەژاردا.

ئۆقرە و ئارامی و دان بەخۆدا گرتن پێشاندەری ئەقڵێکی بەرز و ئاستی هێز و توانایە لە کۆنترۆڵکردنی خۆتدا بەرانبەر بزوێنەرە دەرەکییەکان.مامۆستایەك کە ئاگایی و خوێندەواریی لەبارەی هەڵچوونەوە نەبێت ناتوانێت زەمینەیەکی فێرکردنی گونجاو بۆ هێنانەکایەی پەیوەندی و گواستنەوەی بابەتەکان بۆ قوتابییەکانی دابین بکات.

# سوپاسگوزاری لە تۆفاندا

هەبوونی رۆحیەتی سوپاسگوزاری یەکێکە لە گەورەترین نیشانەکانی بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ و گەشبینی. ئەم رۆحیەتە مرۆڤ لە حاڵەتی پەنگخواردنەوە و ئازارچەشتن دەخاتە ناو بارودۆخی کارتێنەکران و هەستکردن بە قەناعەت لە ژیاندا.

مامۆستا رەزا، کەسێکی دڵخۆش و سوپاسگوزار بوو. ئەو تەنانەت لە خراپترین هەلومەرجدا ئارامی ناوەوە و نەرمی خۆی لەدەست نەدەدا و ئەم مەسەلەیە هەمیشە هاوڕێیان و قوتابییەکان سەرسام دەکرد...

رۆژێکیان هەوا زۆر تۆفانی بوو، بارانێکی چڕ داباری و لافاو زیانی گەورەی بە دانیشتووانی گوند گەیاند. بەڵام هەمووان مامۆستا رەزایان بینی کە دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردووەتەوە و لەبەرانبەر هەموو شتێکدا سوپاسی خوا دەکات و هەر ئەم مەسەلەی بووە هۆی سەرسوڕمانی ئەوانیتر. لێیان پرسی، بەم کەش و هەوا نالەبار و ئەم هەموو کارەسات و نەگبەتییە کوا جێگەی سوپاسگوزاری ماوە؟

مامۆستا رەزا لە وەڵامدا وتی: (دەبێ سوپاسی خودا بکەین کە هەلومەرجی کەش و هەوا هەموو رۆژێك بەم شێوەیە نییە. ئەم لافاوە نیعمەتی هەبوونی رۆژانی هێمن و بێ گرفتمان بیر دەخاتەوە. ئێمە بەو رۆژانە نازانین مەگەر ئەوەی کە پێچەوانەکەیان ئەزموون بکەین.

**سەرنج:**

—نەخۆشیی ئەمڕۆ بیرمان دێنێتەوە کە ڕۆژانێک سەلامەت بووین و پێمان نەدەزانی.

—قەیرانی دارایی ئەمڕۆمان، بەهای پارە و ماڵی دوێنێمان بۆ ئاشکرا دەکات.

—تەنیایی ئەمڕۆمان، نیعمەتی هەبوونی هاوڕێی باشی دوێنێمان بیر دێنێتەوە.

—شڵەژان و دڵتەنگیی ئەمڕۆ ئەو ساتە ئارام و جوانانەمان بیر دێنێتەوە کە تیایاندا بووین و قەدرمان نەزانین بۆئەوەی سوپاسگوزاری ژیان بین.

—لە کۆتاییشدا شاعیری پێشەنگی فارس بەم شێوەیە بەرەو گەشبینی و بینینی نیوەی پڕی پەرداخەکە بانگهێشتمان دەکات:

ڕۆژگار پێیدام پەندێکی ئازادانە

گەر بڕوانی لە ڕۆژگار هەمووی پەندە

بۆ ڕۆژی خۆشی خەڵکی بێ ئەمان خەم مەخۆ

کەسێکیش هەیە یەکجار زۆر ئاواتەخوازە بۆ ڕۆژی تۆ

گەر سەری هەر مویەکم زمان دەربکات
شوکرەکانی تۆ کۆتاییان نایەت

(مەولانا)

## لە سکاڵاوە تا سوپاسگوزاری

رابیعە، پیاوێکی بینی کە پارچەیەکی لەسەری خۆی بەستبوو. پرسیاری کرد:

—(بۆچی ئەم پارچەیەت لەسەرت بەستووە؟)

—پیاوەکە وتی: (ژانە سەرم لێیە).

—رابیعە پرسی: (تەمەنت چەندە؟)

—کابرا وتی: (چل ساڵ)

—رابیعە لێی پرسی: (لەم چل ساڵەدا زیاتر نەخۆش بوویت یان تەندروست؟)

—کابرا وتی: (تەندروست!)

—رابیعە وتی: (لە هەموو تەمەنتدا هەرگیز نیشانەی شوکرت لەسەرت داوە کە ئێستا بۆ ژانەسەرێك پارچەیەکت وەکو نیشانەی سکاڵا لەسەرت بەستووە؟)

هێز سوپاس ئەکات و لاوازی سکاڵا دەکات. پەیوەندییەکی راستەوخۆ هەیە لەنێوان سوپاسگوزاربوون بەهۆی ئاستێکی هێز و توانای کەسییەوە و سکاڵاکەربوون بەهۆ بێ دەسەلاتی و نەبوونی هێزەوە.

ئـەوەی دەپەرستێت ئـارەزوو و ئەوەشـی کەلـە کینـە
دەگەڕێت بەم زەوییە لە هیچ کەس ئافەرین نابیستێت
(فیردەوسی)

## نەکەوتنەژێر ڕەخنە

شەوێکیان بێرنارد شۆ چوو تەماشای یەکێك لـە شـانۆگەرییەکانی خـۆی بکـات. کاتی کۆتاییهاتنی شانۆگەرییەکە، تەماشەکەران کە ئەویان لە هۆڵەکـەدا بینیبـوو، بە کۆمەڵ هاواریان کرد و داوایان لە شۆ کرد کە قسەیان بۆ بکات.

شۆ بە ناچاری چووە سەر تەختەی شانۆ و هەموان لەیەك کاتدا بێدەنگ بوون. بەڵام شۆ هێشتا دەمی نـەکردبووەوە قسـە بکـات کـە یـەکێك لـە ئامـادەبووان لـە کۆتایی هۆڵەکەدا وتی: (شانۆگەرییەکی زۆر خراپ بوو!)

لەبەرانبەر ڕەخنەی حەق و ناحەقی ئەوانیتردا کاردانـەوەت چـۆن دەبێـت؟ ئایـا دەوروژێیت و هەڵدەچیت یان هەوڵ دەدەیت بە ئـارامی ڕووبـەڕووی ئـەو ڕەخنەیـە ببیتەوە کە ئاراستەت کراوە؟

بێرنارد شۆ وەکـو خـوی هەمیشـەی بـە خوێنسـاردییەکی تـەواوەوە پێکـەنی و وتی: (بەڵێ، منیش هەمان رای تۆم هەیە، بەڵام چی بکەم کە من و تـۆ لەبەرانبـەر ئەم زۆرینەیە گەورەیەدا کەوتووینەتە ناو کەمینەیەکی نامۆوە!)

***

قسەی ناشیرینیان بە حەکیمێك وت و ڕەخنـەی ناڕەوایـان ئاراسـتە کـرد، بـەڵام ئەو بێدەنگ بوو. پێیان وت: ئەی حەکیم! بۆچی وەڵامت نەدایەوە؟

وتی: چونکە ناچمە ناو شەڕێکەوە کە براوەکەی لە دۆڕاوەکەی خراپترە.

دەتــووانی دەروازەی شـــار داخەیتبـــەڵام
دەمی نەیار ناتووانیت داخەیت

(مەولانا)

# دکتۆر موسەدەق و دایکی

دکتۆر موسەدەق دوای سەردەمی سەرۆك وەزیرانییەکەی، رۆژێکیان لە زینداندا باسی بوێری و گەورەیی (نەجم ئەلسەڵتەنە)ی دایکی کرد: بۆ یەکەمین جار منیان لە ئەسفەهانەوە بۆ نوێنەرایەتی ئەنجومەنی شورای میللی هەڵبـژاردبوو. تەمەنم نەگەیشتبووە ئاستی یاسایی و قبوڵکردنی خۆشم رانەگەیاندبوو. بەڵام یەکێك لە رۆژنامەکان بە دەربڕینێکی توند، تۆمەتی نارەوای دابووە پاڵم کە بەهۆی توندی هێرشە نارەواکانییەوە تووشی تا هاتم و داخڵی نەخۆشخانە کرام.

دایکی رەحمەتیم لە نەخۆشخانە هاتە لام و پرسی: (بۆچی لەم کاتەی رۆژدا خەوتوویت؟) رۆژنامەکەم دایە دەستی و وتم: سەیرکە چ تۆمەتێکی خراپیان داوەتە پاڵم! دایکم بە کورتی خوێندییەوە، رۆژنامەکەی فڕێدا و بە توانجەوە وتی: لەبەرئەوەیە تات لێهاتووە؟

وتم: بەڵێ.

بە نوکی پێی چەند جارێك کێشای بە پێما و بە نیگەرانییەوە وتی: هەستە، هەستە دەی!

ئەگەر بەرگەی ئەم قسانەت نەدەگرت بۆچی کۆلێژی یاسات دەخوێند؟ دەتویست ببیتە پزیشك!

پاشان وتی: (قەدر و نرخی هەموو کەسێك لەناو کۆمەڵدا بە ئەندازەی ئەو زەحمەت و رەنجەیە کە لە رێگەی ئەو کۆمەڵ و خەڵکەدا ئەیبینێت).

دکتۆر موسەدەق پاش گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە وتی: جەناب! من لە پێخەف هاتمە دەرەوە و لەوە بەدوا هیچ کاتێك قسەی ناشیرین، جوێن و تۆمەتە درۆکان کاریان لە من نەکردەوە.

زمانێك كە قسەی ناراست دەهۆنێتەوە
بە بێدەنگـــی دەبێ وەڵام بـــدرێتەوە
(نیزامی)

## لێگەڕێ چی دەڵێت با بیڵێت

سەربازێكی ئینگلیز بۆ چوون بۆ بارەگای سەربازی عەباسیەی میسر، كـەرێكی بە كرێ گرت و سواری بوو. خاوەنی كەرەكە لە پشت كەرەكـەوە دەڕۆیشـت و بـە خـەیاڵی ئـەوەی كـە سـەربازەكە عـەرەبی نازانێـت لـەكاتی لێخـوڕینی كەرەكـەدا چەندەی حەزیكرد جوێنی بەو پیاوەدا.

ڕێبوارێك سەربازەكەی وەستاند و پێـی وت: دەزانـی خـاوەنی كەرەكـە دەڵێـت چی؟ ئەو جوێنت پێدەدات؟

ئەو سەربازە پرسیاری كرد: ئایا ئەم قسانە دەبنە ڕێگر لەبەردەم گەیشـتنم بـە عەباسیە؟

ڕێبوارەكە لە وەڵامدا وتی: هەڵبەت نەخێر!

بۆیە سـەربازەكە وتـی: لێیگـەڕێ چـی دەڵێـت بـا بیڵێـت! ئـەوەی كـە بـۆ مـن پێویستە تەنیا گەیشتنە بە عەباسیە و هیچی تر!)

**سـەرنج:** مـرۆڤ كاریگــەر و بــەهێز هــەرگیز ڕێگـە بــە خــۆی نـادات وزە لــە وەڵامدانەوەی ڕەخنەگران و جنێوفرۆشان بە خەرج بدات كە دەبنە ڕێگری گەیشتن بە ئامانجەكەی.

پیشەی من هەمیشە عاشقی و بێباکی بوو
ئیتر تێبکۆشم و سەرقاڵی کاری خۆم بم
(حافز)

# چیرۆکی جوانی تەرکیزی فیکر

(بێن هۆگان)ی یاریزانی گۆڵف خۆی بۆ لێدانێك ئامادە دەکرت، لەپڕ لە دوورەوە گوێی لە دەنگی تۆقێنەری سافیرەی شەمەنەفەر بوو. دوای ئەوەی هۆگان تۆپەکەی هاویشتە ناو کونەکە، لێیان پرسی:

دەنگی فیکەی شەمەنەفەرەکە هۆشی پەرت نەکردیت؟

هۆگان لە وەڵامدا وتی: کام فیکەیە؟

**سەرنج:** ژیان وەکو یاریی گۆڵف وایە. تەرکیزکردنە سەر ئامانج و گوێ نەدان بە هیچ شتێك کە تەرکیزمان تێکبدات، مەرجی بردنەوەیە. یەکێك لە گەورەترین ئەو شتانەش کە تەرکیزی مرۆڤ لە یاری گۆڵفی ژیان تێکدەدات، دەنگی فیکەی شەمەنەفەر (رەخنەی ئەوانیتر)ە.

قەت رێگە مەدە بەوەی کە پرسیارەکانی نائومێدیی رەخنەگران حەسودەکان، رکابەر و خراپەخوازان بتخەنە ژێر کاریگەرییەوە بە جۆرێك کە کۆنترۆڵت لە دەست بدەیت. کۆنترۆڵ و تەرکیزی بیرکردنەوە بنچینەی نەکەوتنە ژێر کاریگەرییە.

# بەڕێوەبردنی توڕەیی لە دنیای بەڕێوەبردندا

پێش ساڵانێك یەكێك لە بەڕێوەبەرانی پێشكەوتووی كۆمپانیایەكی نەوت بڕیارێكی هەڵەی دا و لەبەر ئەم هۆیە، زیاتر لە دوو ملیۆن دۆلار زیان بە كۆمپانیاكە گەیشت. (جۆن دی راكفێلەر)ی بەڕێوەبەری كارای ئەو كاتەی كۆمپانیاكە بوو. رۆژێكیان كە هەواڵی زیانەكە لە كۆمپانیاكەدا بڵاو بووەوە زۆربەی بەڕێوەبەرانی كۆمپانیا بە بیانووی جیاجیا هەوڵیان دەدا خۆیان لە بەڕێوەبەری كارا بەدوور بگرن تا بەر توڕەیی ئەو نەكەون.

تەنیا كەسێك كە ئەو رۆژە بوێری ئەوەی هەبوو بچێتە دیدەنی بەڕێوەبەری كارا كەسێك بوو بەناوی (ئێدوارد.تی.بێدفۆرد). ئەو یەكێك بوو لە شەریكەكانی كۆمپانیاكە و باش دەیزانی كە دەبێ خۆی ئامادە بكات بۆ بیستنی وتارێكی درێژ لەدژی بەڕێوەبەرێك كە هەڵەی كردووە.

كاتێك بێدفۆرد چووە ناو ئۆفیسی كاری (راكفێلەر) كەللەی بەهێزی ئیمپراتۆری كۆمپانیای گەورەی نەوت لەسەر مێزی كارەكەی گرمۆڵە ببوو و خەریكی نووسین بوو لەسەر كاغەز. بێدفۆرد بێدەنگ و هێمن بەبێ ئەوەی كە سەر بكاتە سەری لەوێ وەستا. راكفێلەر پاش چەند خولەكێك سەری بەرز كردەوە و بەهێمنی وتی: (ئاه بێدفۆرد، ئەوە تۆی؟ پێدەچێ هەواڵی زیانی كۆمپانیاكەت بیستبێت؟) بێدفۆرد دەستبەجێ هەواڵە ناخۆشەكە پەسەند كرد.

راكفێلەر وتی چەند رۆژێكە كە لەبارەی بابەتەكەوە بیر دەكەمەوە و پێش ئەوەی بەڕێوەبەری پەیوەندیدار بۆ لێپرسینەوە بانگ بكەم، خەریكی یادداشتكردنی هەندێ بابەتی گرنگ بووم.

بێدفۆرد دواتر پاشماوەی چیرۆکەکەی بەمجۆرە گێڕایەوە:

لە سەرەوەی کاغەزەکە نوسیبووی خاڵە بەهێزەکانی بەڕێز...، پاشان پێڕستێکی درێژی لە تایبەتمەندییە باشەکانی بەڕێوەبەر نوسیبوو لەوانەش شرۆڤەیەکی کورتی کۆمەکەکانی بۆ کۆمپانیا، بڕیاری دروست لەبارەی بوارە جیاجیاکان، ئەو بڕیارانەی کە بڕە پارەی زیاتر لە زیانەکانی دوایی بەخشیبوو بە کۆمپانیا.

بێدفۆرد دەڵێت: من هەرگیز ئەم وانەیە لەبیر ناکەم. لە ساڵانی دواتردا هەر کاتێك دەمویست رووبەڕووی کەسێك ببمەوە و سزای بدەم پێش هەر شتێك خۆم ناچار دەکرد لە پشت مێزەکەوە دانیشم و بە تێڕامانەوە پێڕستێکی درێژی خاڵە بەهێزەکانی هەمان کەس ئامادە بکەم و تەنیا پاش ئامادەکردنی پێڕستێکی وەها بۆم دەردەکەوت کە دەتووانم مەسەلەکەلە رەهەندە راستەقینەکەیەوە تاووتوێ بکەم و ئەم مەسەلەیە بووە هۆی ئەوەی کە پڕخەرجیترین ئەو هەڵانەی کە هەر بەڕێوەبەرێك ئەگەری هەیە ئەنجامیان بدات و ئەو شتەی جگە لە تووڕەیی هیچی تر نییە، دوور بکەومەوە. من پێشنیار دەکەم هەر کەسێك کە سەروکاری لەگەڵ خەڵکدا هەیە ئەم شێوازە بەکار بێنێت.

# تۆ کەسێکی ئازادیت

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (د.خ) لەناو ئەصحابی (صفە)دا دانیشتبوو. یەکێکیان بە پێغەمبەری وت: (ئەی پێغەمبەری خودا! من لەناوەوەمدا هەستێکی تایبەتم هەیە کە بەهۆیەوە هەموو دنیا لەبەرچاوم بێنرخە. ئێستا بەرد و ئاڵتون لەبەرچاوم هەر یەکە (واتە هێزی ئاڵتون و بەرد لەوەدا کە بەرەو خۆیان رامبکێشن وەکو یەکن).

پێغەمبەر (د.خ) سەیرێکی کرد و وتی: تۆ پیاوێکی ئازادیت.

**سەرنج:** نەبوونی حەز و وابەستەیی، ئازادی بۆ مرۆڤ دابین دەکات. کەسێك کە بەشێوەیەکی رەها گیرۆدەی ژیانی سەر زەوییە ناتووانێت کەسێکی خاوەن سەرچاوەی وەرچەرخانی پۆزەتیڤ و کاریگەربوونی بونیادنەر بێت.

یەکتاپەرست گەر ئالتونی بۆ هەڵڕێژیت یان
شمشێری هیندی لەسەر ملی دانێیت هیوا و
ترسی نییە لە کەس بنەمای یەکتاپەرستی
هەر ئەمەیە و بەس

(سەعدی)

## حاڵەتی یەکتاپەرست چۆنە؟

دەڵێن رۆژێکیان ( شێخ ئەبوبەکر واستی)ی سۆفی لەگەڵ هاورێ و دۆستانیدا لە ماڵەوە دانیشتبوو و کلاورۆژنەیەك لەو ماڵەدا هەبوو. لەناکاو هەتاو لەو کلاورۆژنەیەوە هاتە ناوەوە. هەزاران گەردیلەی تۆز بەرز ببووەوە. شێخ وتی: ئەم جوڵەیەی گەردیلەکان هەراسانتان ناکات؟

دۆستان وتیان: نەخێر.

شێخ وتی: (مرۆڤی یەکتاپەرست ئەوەیە کە ئەگەر هەموو کەون و جیهانەکان و هەرچییەکی تر کە هەیە وەکو ئەم گەردیلانە بێنە جوڵە، تاکە گەردیلەیەك یەکتاپەرست پەرت نەکات).

# تێڕوانینی نەکەوتنە ژێر کاریگەری

بیرمەندێك دەیگێڕایەوە: ڕۆژێك لەگەڵ باوکیاندا لە شیرازەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان لە تاران و بۆیان دەرکەوت کە دز هاتووەتە ماڵیان و هەموو ئامرازەکانی ماڵی بردووە و هیچ شتێکی بەجێ نەهێشتووە. هەموویان دەستیانکرد بە دەربڕینی ناڕەزایی و گلەیی و زۆر نارەحەت بوون. هەموویان دەیانوت هەموو شتێکیان بردوو و ئیتر هیچمان نییە.

بەڵام باوکی خێزانەکە بە ریتمێکی ئاساییەوە وتی: بۆچی ناڕەزایی دەردەبڕن؟ ئەم ئامرازانە و پێویستییەکان هێشتا لەم دنیایەدان تەنیا شوێنیان گۆڕاوە. یەکێك لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە تۆ دەخاتە ریزبەندی کارتێنەکراوەکان بایەخدانە بە هێزی تێڕوانین و چۆنێتی شیکردنەوەی ڕووداوەکان و هەلومەرجەکان. ئەنتۆنی رۆبنز بڕوای وایە کە بۆئەوەی ڕۆحیەی خۆت بە دروستی بەڕێوە ببەیت ئەوا دەبێ یەکێك لەم تەکنیکانەی خوارەوە بخەیتە کار:

١-گۆڕینی زەمینە: واتە لە هەموو ڕووداو و ئەزموونێکی ناخۆش و نیگەرانکەردا خاڵی پۆزەتیڤ بدۆزینەوە.

٢-گۆڕینی ناوەڕۆك: هەڵێنجان و مانایەکی پۆزەتیڤمان بۆ ڕووداوە نەخوازراوەکان هەبێت.

دەڵێن جارێکیان جەنەراڵێکی بە سەربازەکانی خۆی وت: (ئێمە پاشەکشە ناکەین بەڵکو بە ئاراستەیەکی تردا خەریکی بەرەوپێشچوونین).

لە ڕووداوی دزییەکەدا، باوکی خێزانەکە بە گۆڕینی تێڕوانینی بۆ ئەو ڕووداوەی کە ڕوویدابوو، تووانی لە کەوتنە ژێر کاریگەر دوور بکەوێتەوە و بە شێوازێکی تر بەسەرهاتەکە شی بکاتەوە.

# جوامێرە کارتێنەکراوەکان (١)
# خۆبەڕێوەبردنی جوامێرێک

دەڵێن: کاتێك ئەبو عوسمان  بە شوێنێکدا ڕەت ئەبوو، لە سەربانەوە تەشتێك گڵیان بەسەر سەریدا بەردایەوە. تەشتەکە بەر سەری کەوت. قوتابییەکان دەمیان بەرانبەر کابرا کردەوە.

ئەبو عوسمان وتی: هیچی پێ مەڵێن، هەر کەسێك کە شایستەی ئەوە بوو ئاگری دۆزەخی بەسەردا بکەن، بە گڵ سوڵح بکات، توڕەبوون پێویست نییە.

بولبول لـه گـولّ ناڕەنجێـت ئەگەرچـی
ئازاریشی بدات.

(سەلمان ساوجی)

# جوامێرە کارتێنەکراوەکان (٢)
# جوامێری خۆگر

کەسێك جوێنی بە جوامێرێك ئەدا و هەر بەدوایەوە بوو. جوامێرەکە، هیچ خـۆی تێك نـەدا و بێـدەنگ مایـەوە. کـە گەیشـتە نزیـك قەبیلەکـەی خـۆی، وەسـتا و بـە کابرای جنێوفرۆشی وت:

(براکەم! ئەگەر هێشتا جوێنت پێ ماوە، هەر لێرە تەواوی بکە، چـونکە ئەگـەر قەومەکەم گوێیان لێ بێت، ئازارت ئەدەن).

# نەگۆڕان لە ئاشەوە فێر بین

ڕۆژێکیان ئەبوسەعید ئەبولخەیر لەگەڵ کۆمەڵێک دۆست و هاوڕێدا گەیشتنە لای ئاشێک. شێخ ئەسپەکەی خۆی ڕاگرت و سەعاتێک وەستا.

پاشان لە بەرانبەر دۆستانیدا وتی: (یاوەران! وەکو ئەم ئاشە بن کە ڕەق (گەنم) وەردەگرێت و نەرم (ئارد) دەداتەوە و بەدەوری خۆیدا دەسوڕێت تا ئەوەی کە شایستە نییە لە خۆی بکاتە دەرەوە.

هـەر گەورەیـەك كـە بـە فـەزڵ و هونـەر
گەورە بوو ورد نـەبێ بـە قسـەی خـراپ و
ئەمە و فلان

(فەرخی سیستانی)

# جوامێرە كارتێنەكراوەكان
# شێخ و قوتابییەكەی

ڕۆژێكیان مامۆستایەك لەگەڵ قوتابییەكەیدا بە بازاڕدا دەڕۆیشتن. دەنگێك بەر گوێ كەوت كە گوتی ئەم پیرە زەندیقە هات. بەڵام قوتابییەكە زۆر تـوڕە بـوو و هێرشی كردە سەری.

شێخ وتی ئەگەر ئارام بیتەوە شتێكت فێر دەكەم. كە گەیشتنە ماڵەوە، بە قوتابییەكەی وت: ئەو سنوقە بێنە.

پاشان شێخ كۆمەڵە نامەیەكی خستە بەردەمی و فەرمووی: سەیركە. لە هەموو كەسێكەوە نامەم بۆ هاتووە، یەكێك بە (شێخی ئیمام)ناوم دەبات و یەكێكی تر بە (شێخی زاهید) و ئەویتر بە (شێخی زیرەك) و یەكێكی تر بە (شێخی حەرەمەین). هەر كەسەو بە پێی بیروباوەڕی خۆی قسەی كردووە و ناونیشانی بۆ داناوم. ئەگەر ئەو بێچارەیەش بەپێی باوەڕی خۆی قسەیەكی كردبێت و ناونیشانێكی بۆ دانابێتم، ئەم هەموو هەرایەت بۆ نایەوە؟

سەرنج: توڕەبوون لە قسە و كرداری ئەوانیتر واتە نرخ دانان بۆیان. گاڵتەجاڕیی ژیانی ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە كە قسەی ناراستی ئەوانیتر بە درۆ ناو دەبەین و پاشان لە ژێر كاریگەری ئەو درۆیەشدا هەڵدەچین.

***

منالێك كە تاكە پێڵاوەكەی دەریا لێی سەندبوو لەسەر لمی كەناراوەكە نووسی: دەریا پێڵاوەكانمی دزی.

ئەو پیاوەی كە لە دەریا ماسی گرتبوو. لەسەر لمەكە نووسی: دەریا تۆ بەخشندەترین سفرەیت. شەپۆلێك هات و رستەكانی شتەوە...

و تەنیا ئەم پەیامەی بۆ من جێ هێشت كە بۆچوونەكانی ئەوانیتر لەبارەی خۆت لە فراوانیی خۆتدا بتوێنەوە تا دەریا بیت.

ئەی دڵ لە تانەی حەسودان مەڕەنجێ و دڵنیا
بەکە خراپی ناگاتە بیری ئومێدەواری ئێمە
(حافز)

## جوامێرانی کارتێنەکراو (٤)
## پیاوی دەوڵەمەند و دراوسێی حەسود

ڕۆژێکیان پیاوێك خانوویەکی شکۆمەندانە و جوانی کڕی کە حەوشەیەکی گەورەی بە درەختی میوەوە هەبوو. خانووەکەی تەنیشتی کۆن بوو کە خاوەنێکی حەسودی هەبوو و هەمیشە هەوڵی ئەدا کاتەکانی لێ تاڵ بکات و زۆرجار بە ڕشتنی زبڵ لەبەردەم ماڵەکەیدا و ڕشتنی خۆڵ و خاشاك لە حەوشەی ماڵەکەیدا ئازاری ئەدا.

ڕۆژێکیان بەیانییەکەی بە دڵخۆشی لە خەو هەڵسا و هەر کە چووە هەیوانەکە سەیریکرد سەتڵێکی پڕ لە خۆڵ لە هەیوانەکەیە. سەتڵەکەی پاك کردەوە و پڕی کرد لە میوەی تازە و گەیشتووی حەوشەکەی خۆی تا بۆ هاوسێیەکەی ببات.

کاتێك دراوسێکە گوێی لە دەنگی دەرگادانی ئەو بوو دڵخۆش بوو و لەبەر خۆیەوە وتی ئەمجارە ئیتر هاتوو بۆ شەڕ. کاتێك دەرگاکەی کردەوە، پیاوەکە سەتڵێکی پڕ لە میوەی تازە و گەیشتووی دایە و وتی: (هەرکەسێك ئەو شتە لەگەڵ ئەویتردا بەش دەکات کە زیاتری لێی هەیە).

لەبارەی تەقوا و جوامێرییەوە لە (محەمەد ترمزی)یان پرسی. وتی: تەقوا ئەوەیە کە لە قیامەتدا هیچ کەسێك یەخەی تۆ نەگرێت و جوامێریش ئەوەیە کە تۆ یەخەی کەس نەگریت.

## جوامێرانی کارتێنەکراو (٥)
## جونەید و دزی کراسەکە

دەڵێن شەوێکیان دزێك چووە ماڵی جونەید. جگە لە کراسێك هیچی نەدۆزییەوە، دەستیدایە و رۆیشت. رۆژێکی تر لە بازار دەگەڕا. کراسەکەی خۆی بە دەستی دەلاڵێکەوە بینی کە دەیفرۆشت و کڕیارەکە داوای ئاشنا و شایەتی دەکرد تا دڵنیا بێت لەوەی کە هی ئەوە، تا بیکڕێت.

جونەید نزیك بووەوە و وتی: من شایەتی ئەدەم کە هی ئەوە.

# جوامێرانی کارتێنەکراو (٦)
# لەسەرخۆیی و نەرمی

دەگێڕنەوە حاجی شێخ جەعفەر خاوەنی (کشف الغیتا) لە شاری ئەسفەهان، پێش ئەوەی دەست بکات بە نوێژکردن، پارەیەکی لەنێوان هەژاراندا دابەش کرد و پاشان بۆ نوێژ وەستا.

یەکێك لە سەیدە هەژارەکان ئەوی بینی و لەنێوان دوو نوێژدا چووە خزمەتی شێخ و وتی: ماڵی باپیرەم بدەرەوە!

شێخ فەرمووی: تۆ درەنگ هاتوویت و ئیتر هیچ شتێك نەماوە بیدەمە تۆ. سەید نیگەران بوو و تفی لە روخساری شێخ کرد.

شێخ لە میحراب هەڵسا و داوێنی خۆی گرت و لەنێوان ریزەکانی نوێژی جەماعەتدا دەورێکی کرد و فەرمووی:

(هەر کەسێك ریشی شێخی خۆش دەوێ، یارمەتی سەید بدات).

خەڵکی دامێنی شێخیان پڕ کرد لە پارە و ئەویش بە سەیدی بەخشی.

قسەی نەرم دانایيە، قسەی ڕەق شێتييە

(نيزامی گەنجەوی)

# جوامێری کارتێنەکراو(٧)
# خزمەتکاری کارتێنەکراو

ڕێبوارەکە وەکو هەمیشە سەیرێکی لیستی خواردنی ریستۆرانتەکە کرد لە شەمەنەفەرەکەدا. لیستی خواردنەکە لەفەی مریشك و لەفەی زەڵاتەی مریشکی تێدابوو. ئەو بڕیاریدا لەفەی زەڵاتەکە بخوات بەڵام بەهۆی سەرقاڵییەوە لەسەر کاغەزی داواکارییەکە لەفەی مریشکی نووسی. کاتێك خزمەتکارەکە لەفەی مریشکەکەی هێنا، ڕێبوارەکە بە توڕەییەوە ناڕەزایی دەربڕی.

زۆربەی خزمەتکارەکان لەکاتێکی وەهادا تەنیا کاغەزی داواکردنی خواردن پیشانی کڕیار دەدەن تا بیسەلمێنن کە هەڵە لەلایەن کڕیارەوە بووە بەڵام خزمەتکارەکە ئەمەی نەکرد.

لەبەری ئەمە، وێڕای پۆزش هێنانەوە بۆ ئەو هەڵەیەی کە ڕوویدابوو لەفەی مریشکەکەی لەبەردەم پیاوەکە هەڵگرت و چووە مەتبەخ و ساتێك دواتر لەفەی زەڵاتەی مریشکی لەبەردەم کابرا دانا.

کاتێك ڕێبوارەکە سەرقاڵی خواردنی لەفەکەی بوو چاوی بە کاغەزی داواکردنەکە کەوت و بۆی دەرکەوت کە هەڵەکە لەلایەن خۆیەوە بوو. ڕێبوارەکە لەکاتی دانی پارە بە خزمەتکارەکە داوای لێبووردنی کرد و پێشنیاری ئەوەی کرد کە پارەی هەردوو لەفەکە بدات.

وەڵامی خزمەتکارەکە ئەوە بوو: نا قوربان، شتی وا نابێ، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ بەهۆی راستبوونمەوە منت بەخشی، بێ ئەندازە خۆشحاڵم.

# پێشەکی

لە فەسڵی سێیەمی کتێبەکەدا، سێ بابەت باسکراوە:

١-کاریگەریی پۆزەتیف لەسەر ئەوانیتر لەوانەش هێنانەکایەی پاڵنەر و هێزی هیوا و چالاکی لە مرۆڤەکاندا گرنگترین پێکهاتەی کاریگەربوونە. ئەم بەشەم بە چەند چیرۆکێك لەو بارەیەوە دەست پێکردووە.

٢-لە بەشی دووەمدا باسی بابەتی کاریگەری دانان (هێزی دەرەکی) و کارتێکران (هێزی ناوەکی) و جیاوازی نێوان ئەو دووانە و ستراتیژی هەر کامەیانم کردووە.

٣-لە کۆتایی ئەم بەشەدا چەند چیرۆکێکی ئیلهامبەخشم لە بواری کاریگەری دانان گێڕاوەتەوە. بەتایبەت هەندێ ژیاننامەی ئەنگێزەبەخشی گەورەپیاوان و ژنانم خستووەتەڕوو کە وێڕای نەهامەتی و کێشەی تاقەتبەر نەك تەنیا توانیوویانە بەسەر ژیاندا زاڵ بن، بەڵکو بە هێزی خۆگرییان هەلومەرجی باشتریان بۆ مرۆڤایەتی هێناوەتە کایەوە. لە تێکستی یەکەمی کتێبەکەدا بەسەرهاتی ئیلهامبەخشی زۆرم کۆ کردبووەوە کە لەبەر چەند هۆکارێك، لەوانەش زیادبوونی قەبارەی کتێبەکە، لامبردن تا لە بەرهەمەکانی دواترمدا جێگەیان بکەمەوە.

عەشق واتە ترش بکەیتە شیرین

عەشق واتە چزوو بکەیتە نۆشین

(موجتەبا کاشانی)

## ١-چیرۆکەکانی کاریگەری دانانی پۆزەتیڤ خواجە نیزام ئەلملوك و جوتیارەکە

جوتیارێکی پیر بە نیازی بەدەستهێنانی بەرهەمی خەیارە نۆبەرەکانی خۆی، سەبەتەیەکی ئامادە کرد و بەرەو ئیمارەتی خواجە نیزام ئەلملوك کەوتە ڕێ. خواجە لەگەڵ هەندێ لە دۆستانیدا دانیشتبوو کە باخەوانەکە هاتە ژوورەوە و سەبەتەی خەیارەکەی لەبەردەمیدا دانا.

خواجە خەیارێکی هەڵگرت و دەستیکرد بە خواردنی. ئەوانیتر چاوەڕێی فەرمووکردن بوو، بەڵام ئەو هەموو خەیارەکانی خوارد و فەرمووی کەسی نەکرد.

کاتێك باخەوانەکە داوای روخسەتی کرد، خواجە سێ دیناری ئاڵتونی وەکو بەخشش پێدا و ئەویش بە دڵخۆشییەوە کۆڕەکەی جێ هێشت. ئینجا خواجە بە دۆستانی وت:

دۆستان! خەیارەکان تاڵ بوون، من ئەترسام لەوەی کە فەرمووتان بکەم و تاڵیی خەیارەکان ئەزیەتتان بدات. ئەو باخەوانە پیرە ماندووبوونێکی زۆری چەشتبوو و هیوایەکی زۆری بە وەرگرتنی بەخشش بوو. ئەگەر بە تاڵیی خەیارەکانی بزانیایە، بێ تاقەت و نارەحەت دەبوو، خەیارەکانم بە تەنیا خوارد و لەبەرانبەر تاڵییەکەیاندا خۆم گرت و هیچ بە روویدا نەدا.

سەنگ و ڕێزی عەشق، دانانی کاریگەریی پۆزەتیڤە و هێنانەکایەی گۆڕان و وەرچەرخانی باشەیە بەسەر دەرووندا. کەسانی کاریگەر وەکو ئامێرێکی گۆڕەر ڕەفتار دەکەن. هەموو شتێك بەرەو باشی، هاوژینی و شادی ڕێنوێن دەکەن و دەگۆڕن. هەر کاتێك ڕەقی ڕەفتاری ئەوانیتر بۆ ئارامگرتن، دڕکی خەفەت بۆ گوڵی بزە، مسی بوون بۆ ئاڵتونی کامڵبوون و چزوو بۆ نۆش بگۆڕێت، دەچێتە ڕیزی کاریگەرەکانەوە...

لەناو ئەو هەموو ژاوەژاو و خراپەیەدا
عەشق واتە کەمردنەوەی رەنجی مرۆڤ
(موجتەبا کاشانی)

# تەمەن بە خۆشی دڵان دەڕوات

(رەحمان) پیرەمێردێکی میهرەبان بوو کە هەمیشە قوتوویەکی رۆنی بچوکی پێبوو. لە هەر شوێن و کۆڕێکدا گوێی لە جیڕەی دەرگا بووایە، بەخێرایی قوتووە رۆنەکەی دەردەهێنا و بە کەمێك هەڵسوینی رۆن ئەو دەنگە هەراسانکەرەی نەدەهێشت.

لە دەوروبەری ئێمەشدا ژیانی زۆر هەن کە پێویستیان بە رۆنی میهرەبانی هەیە. واتە هەر ئەو دڵە ژەنگاوییانەی کە بەهۆی نالەباری و هەوراز و نشێوییەکانەوە بەردەوام جیڕەجیڕیانە. دەبێ ئێمەش وەکو (رەحمان) هەمیشە بڕێك رۆنی لاکردنەوە و رۆنی گرتنە ئامێزمان پێ بێت تاوەکو لە هەر شوێنێك کە پێویست بوو کاریگەریی پۆزەتیڤی خۆمان دەربخەین.

لە خۆشەویستیدا بەرد دەبێتە رۆن

بێ خۆشەویستی مۆم دەبێتە ئاسن

لە خۆشەویستیدا هەوراز تەخت دەبێت

ولە خۆشەویستیدا باری قورس دەبێتە بەخت

(مەولانا)

له جیهاندا هەموو کارێکی باش دەمێنێتەوە
شوێن پێی عەشق تیایدا دەبینرێتەوە
(موجتەبا کاشانی)

## له خۆشەویستیدا، خەم دەبێتە شادی

کاتێك له فرۆکەخانەی گەورەی نیویۆرك چاوەڕوانی گەشتی ئاسمانی بووم، ڕاگەیانرا کە گەشتەکەمان وەستێنراوە و دەبێ گەشتیاران بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی بچنە هۆڵەکەی تەنیشت. کاتێك گەیشتمە هۆڵەکە. ڕیزێکی درێژم بەرانبەر یەکێك له دەرچەکان بینی. چوومە ناو ریزەکە و لەکاتی چاوەڕوانیدا لەناو ریزەکە، بۆم دەرکەوت و کە هەموو گەشتیارەکان تووڕەیی خۆیان بەسەر کارمەندی بڕینی بلیتدا هەڵدەڕێژن. ئەوان لەبەرانبەر لەدەستدانی گەشتەکەیان، تووڕە و شڵەژاو بوون و بەردەوام پرسیاری ئەوەیان دەکرد ئاخۆ ئەبێ چی بکەن؟

کارمەندی فرۆشتنی بلیت لەکاتێکدا کە هەوڵی دەدا ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەو بارودۆخە بخاتەڕوو کە ڕوویداوە، ماندوو دیار بوو و لەبەرانبەر هەر ناڕەزایەتییەکی تازەدا زیاتر سەری شۆڕ دەکرد. کاتێك نۆرە گەیشتە سەر من بڕیارمدا هێزی پێبدەم، بۆیە بە میهرەبانییەوە پێم وت: بە ڕاستی من بە زەحمەتەکانی تۆ دەزانم. دەزانم ئەم بارودۆخە سەختە و تۆ هەرچییەك لەدەستت هاتبێت کردووتە. بینیم تۆ چەنێك لەگەڵ خەڵکیدا لەسەرخۆیت و دڵنیام وەستانی گەشتەکە خەتای تۆی تێدا نییە. ئەو بەم تێگەیشتن و هاوخەمییەی من ئاهێکی هەڵکێشا.

من له قسەکانم بەردەوام بووم: تەنیا دەمەوێ سوپاست بکەم و پێت بڵێم تۆ پیشەیەکی سەختت هەیە و دەبێ شانازی پێوە بکەیت.

ئەو لە وەڵامدا وتی: سوپاست دەکەم. بە راستی ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە پێویستم پێی بوو. پاش بیستنی روونکردنەوەی پێویست، ئەوێم جێ هێشت. بەڵام کاتێك لەناکاو ئاوڕم دایەوە دواوە، بۆم دەرکەوت کە کارمەندی بلیتەکە بۆ وەڵامدانەوەی گەشتیاری دواتر هەستاوەتە سەر پێ و بە دڵنیایی و خۆگرییەوە لەبەرانبەریدا وەستاوە. من وزەی پێویستم پێی دابوو. بۆ من چەنێك ئاسان و ئاسودەبەخش بوو کە سوپاس و پێزانینەکەم دەرببڕم و کاریگەرییە قوڵەکەی لەسەری ببینم.

لە کیمیای سۆزی تۆ ڕووی من بوو بە ئاڵتون
بـــەڵێ بە لـوتفی تۆ خـاك دەبێتە ئاڵتون
(حافز)

## کاریگەریی رەفتاری هاوخەمی

گەڕیدەیـەك لـە هـۆنگ کـۆنگ چـووە دوکـانێکی خشڵفرۆشـی گـەورە و جـوان و سەرقاڵی تەماشاکردنی بەردە گرانبەهاکان بـوو. لـەناو خشـڵەکاندا بـەردێکی تـۆخ هەبوو کە هیچ رەونەقی نەبوو.

گەڕیدەکە بە خشڵفرۆشەکەی وت: ئەم بەردە هیچ جوان نییە.

خشڵفرۆشەکە وتی: بوەسـتە، پاشـان بەردەکـەی دەسـت دایـە و خسـتییە نـاو مشتەکۆڵەیەوە. پـاش چـەند خولـەکێك مشـتەکۆڵەکەی کـردەوە، بـەردێکی جـوان دەبریقایەوە.

خشڵفرۆشەکە وتی: ئەم بەردە ناوی (عقیق)ە. ئێمەی خشڵفرۆش ئەم بەردە بـە بەردی (هاوخەم) ناو دەبـەین. ئەوەنـدە بەسـە کـە بەردەکـە بـۆ چـەند خولـەکێك بخەینە ناو دەستت تاوەکو بە هەستی هاوخـەمیت، جـوانی و درەوشـاوەیی خـۆی دەربخات.

**سەرنج:** ئەوانەی کە بە یەك نیگا کیمیا دەکەنە خاك کێن؟

ئەو کەسـانەن کـە بـە هاوخـەمی و رەفتـارە پشـتگیرییەکان، خـەزانی تـەنیایی کەسە دڵشکاوەکان دەکەنە بەهاری هیوا...

لە خۆشەویستیدا مردوو زیندوو دەبێتەوە
لە خۆشەویستیدا شا دەبێتە بەندە
لە خۆشەویستیدا نەخۆش ساغ دەبێتەوە
و لە خۆشەویستیدا قەهر دەبێتە رەحمەت

[ مەولانا ]

خوی خراپ مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبـــات
کـــە ئەخلاقی چاك هاتووە لە بەهەشت
(سەعدی)

## ٢-لە زاڵبوونەوە بەرەو کاریگەری دانان
## کاممان جوانترین؟

لە چینی کۆندا بازرگانێك بەناوی (زوجی) دەژیا. ئەو هەموو رۆژێـك لـە ئاوێنـەدا تەماشای خـۆی دەکـرد. رۆژێکیـان لـە هاوسـەرەکەی پرسـی: (پێـت وایـە مـن بـە بەراورد بە بەڕێز "شوگون" چۆنم؟ کاممان جوانترین؟)

ژنەکـەی دەسـتبەجێ وەڵامـی دایـەوە: (ئاشـکرایە کـە تـۆ لـە بـەڕێز شـوگون جوانتریت). زوجی بە وەڵامی هاوسەرەکەی خۆشحاڵ بوو بـەڵام بەلاشـیەوە سـەیر بوو، چونکە شوگون بە رۆح سوکی لە شاردا ناسرابوو.

زوجی بـۆ دڵنیـابوون لـە وەڵامـی هاوسـەرەکەی، ئـەمجارە لـە خزمەتکارەکـەی پرسی. خزمەتکار لە وەڵامدا وتی:

(بەڕێز شوگون چۆن دەتوانێت لـە جـوانی و ئەنـدام ڕێکیـدا لەگـەڵ تـۆ بـەراورد بکرێت. بێگومان تۆ لەو جوانتریت).

کەمێك دواتر میوانێك هاتە ماڵی زوجی. ئەویش هەر ئەو پرسیارەی لە میوانەکە کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە: (بەو جۆرەی کە من ئـەیبینم تـۆ لـە بـەڕێز شـوگون ئەندام ڕێکتریت). سبەی ئەو رۆژە بەشێوەیەکی ڕێکەوت، بەڕێز شوگون بۆ ئیشێك چووە لای زوجی. ئەو بە وردی تەماشای شوگونی کرد و دڵنیا بوو لـەوەی کـە بـە راستی شوگون لەو جوانترە.

ئەو لەبەر خۆیەوە وتی: (هۆکارەکە چیە کە هاوسەرەکەی، خزمەتکارەکەی و میوانەکەشی، هەرسێکیان درۆیان لەگەڵدا کردووە؟)

زوجی پاش بیرکردنەوەی زۆر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لەبەرئەوەی ژنەکەی خۆشی دەوێت، ئەو بە چاوی هاوسەر لە هەمووان جوانتر دەبینێت. بەڵام لەبەرئەوەی خزمەتکارەکە ترسی هەیە لەوەی سۆز و خۆشەویستی نادرێتێ، راستییەکەی نەوتووە و میوانیش لەبەرئەوەی بەدوای داواکارییەك کەوتووە زمانلوسی خۆی دەرخستووە تا بگاتە مەبەستەکەی...

(چۆن چۆنی لەوانیتردا کاریگەری دابنێین؟) (رازەکانی سەرنجڕاکێشی کامانەن؟) (کاریگەری و بەکێشکردن لە یەکەمین سەرنجدا).

دەشێ تۆش رووبەڕووی ناونیشانی کتێبی لەم جۆرە و یان خولی فێرکاری لەم بارەیەوە بوویبیتەوە.

لە بنەڕەتدا زیادبوونی بەکێشبوونی تاکەکەسی بۆ بەشێکی زۆری مرۆڤەکان یەکێکە لە پرسە هەرە سەرنجڕاکێشەکان. یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی ئەم مەسەلەیە حەزی مرۆڤە بۆ خۆشویستران و بوونە جێگەی رەزامەندییە. هۆکارە گرنگەکەی تر ئەوەیە کە بەکێشبوون هێز لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. واتە هێز لەوانیتر و کۆنترۆڵکردنیاندا.

هەرچەندە دەشێ زاڵبوون ئاکامی پۆزەتیڤیشی هەبێ بەڵام لێرەدا حەز دەکەم (زاڵبوون) بە مانا نێگەتیڤەکەی باس بکەم و لەبەرانبەر کاریگەربوون (رەفتاری پۆزەتیڤ)دا دایبنێم. واتە ئەو زاڵبوونەی کە لە ئاقار ئامانجە کەسییەکاندا بەکار دەهێنرێت و تیایدا بەرژەوەندیی کەسەکان لەبەرچاو ناگیردرێت.

## دوو سەرنج:

١-یەکێك لە گرنترین جیاوازییەکانی نێوان زاڵبوون و کاریگەربوون جیاوازییە لە مەبەست و نیەتیاندا. زاڵبوون کردار و کاردانەوەی ئاگایانە و ئەنقەستە کە تاکەکەس بۆ کۆنترۆڵی بیروباوەڕ، هەستەکان و رەفتاری کەسەکان سوودی لێ وەردەگرێت. بەلام لە کاریگەری داناندا مەرج نییە تاکەکەس بەدوای ئەوەدا وێڵ بێت کە کەسەکە بخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. بەڵکو کارتێکەرەکە بەزۆری بەپێی زنجیرەیەك پێوەری ناوەکی رەفتار دەکات و زاڵبوون نەك وەکو ئامانجێك بەڵکو ئەنجامی نائاگایانە و لاوەکی، شێوازێکی بڕیاردان و شێوازی ژیانە.

٢-چەند پەیوەندییەکی بنەڕەتی کە تیایدا زاڵبوون و کارتێکردن هەیە و من جەختیان لێدەکەمەوە، ئەمانەی خوارەوەن:

١-پەیوەندی ناو خێزانی کە بەزۆری دوو پەیوەندیی باوك-منالّ و پەیوەندیی نێوان هاوسەرەکان دەگرێتەوە.

٢-پەیوندی فێرکاری (مامۆستا و فێرخواز)

٣-پەیوەندیی پیشەیی و ئابووری سەرۆك و کارمەند)

٤-پەیوەندییەکانی ئاستی گەورە (فەرمانڕەوا و هاولاتی)

لەدوایی باسی تایبەتمەندی و جیاوازیی زیاتری نێوان ئەم دوو مۆدێلە، واتە (کاریگەری) و (زاڵێتی) دەکەم.

# ئەلف-سەرچاوەکانی زاڵبوون
# رێوی و بەور

رۆژێکیـان رێوییـەك کەوتـە چـنگی بـەورێکی برسـی و درِنـدە. کاتێك بەورەکـە ویستی رێوییەکە بخوات: چۆن ئەوێریت نوێنەری ئیمپراتۆری ئاسمان بخۆیت؟ ئـەو منی کردووە بە فەرمانڕەوای هەموو گیانەوەران. ئەگەر بمخۆیـت، ئـەوا بـە تونـدی سزات دەدات.

رێوی بە بڕوابـەخۆبوون و ئیمـانێکی وەهـاوە رسـتەکانی دەربـڕی کـە بەورەکـە کەوتە گومانەوە، (لێرەدایە کە دەڵێن مرۆڤێکی بە ئیمان یەکسانە بە سەد کەس و دوو دڵ).

رێوی کە راڕایی و و دوودڵی لە بەورەکـەدا بـینی، بـەردەوام بـوو لـە قسـەکانی: ئەگەر باوەڕت بە قسـەکەی مـن نییـە بـە کـەمێك دوورایـیـەوە لـە پشـت سـەرمەوە برِۆ...ئەو کاتە تێدەگەیت کە هـەموو گیانـەوەران بـە بینـینی هەیبـەتی مـن چۆن رادەکەن...

بەور پێشنیاری رێوییەکەی قبوڵ کرد...رێوی لە پێشەوە و بەورەکـە لـە پشـت سەریەوە کەوتە رێ...بەورەکە بە سەرسوڕمانەوە ئەیبینی کـە لـە هـەر کوێیـەکی دارستان بکەوێتـە رێ هـەموو گیانـەوەران رادەکـەن. ئـیتر هـیچ گومانێـك لـە دڵـی بەوردا نـەما. بۆیـە دەسـتی لـەخواردنی رێویەکـە کێشـایەوە و لەبـەر ئـەو بەهەڵـە تێگەیشتنەی کە روویدابوو داوای لێبووردنی کرد.

مەسەلەی گرنگ لە زاڵبوون و کاریگەربوونی سەرچاوەکان و ستراتیژەکانی کۆنترۆڵ و کاریگەربوونە. کەسی زاڵبوو هێزی بەکێشکردن و قایلکردنی خۆی وەکو چیرۆکی رێوییەکە لە سەرچاوە دەرەکییەکە (بەور) وەردەگرێت. دەشێ ئەم سەرچاوانەی خوارەوە ئەمانە بن:

١-پایەی سیاسی، کۆمەڵایەتی و دینی

٢-سامان

٣-بەکێشبوونی فیزیکی

٤-خۆ هەڵکێشان بە پێگەی خێزان و پێشینان و بواری تر.

دەرەکیبوونی هێز، تایبەتمەندیی بەدەستکەوتبوون دەداتە ناوەندی کۆنترۆڵ. لێرەدا رووبەرووی ئەدەبیاتی (هەبوون)ین:

-هەبوونی سامان

-هەبوونی پێگە و پایە

-هەبوونی زانست و زانیاری

-هەبوونی جوانی جەستەیی

لەبەرانبەر هێزدا، رەوایەتی و توانا، کاریگەرێتی خۆی لە سەرچاوە ناوەکییەکان (ئەوەی کە هەیە) وەردەگرێت. هێزی تۆ پەیوەست دەبێت بەوەی کە هەیت (بوون) نەك ئەوەی کە هەتە (هەبوون).

بەکێشبوون لەسەر بنەمای (بوون) ئاماژەیە بە سێ جۆر تایبەتمەندی کەسی:

١-تایبەتمەندییە دەروونییەکان، بۆ نموونە هەبوونی ئایدیاڵێکی گەورە، بەزۆری نا کەسی و نا تایبەتە (بەئامانجبوون)، لێبڕاوانەیە، هیمەت و بەردەوامییە (رۆحیەتی تێکنەشکان).

٢-هێزی ئەخلاقی، هەبوونی راستگۆیی، شەفافیەت، دادپەروەری، وەفاداربوون بە پەیمان و ئارەزوومەندنەبوون بە رواڵەتەکانی هێزی دەرەکی.

٣-تایبەتمەندییە کەسییەکانی هاوڕێیانە، هەبوونی رۆحیەتی خزمەتگوزاری، بەزەیی، حەز بۆ لەخۆبردوویی.

کۆی ئەم سێ تایبەتمەندییە لە تاکەکەسدا کەسایەتییەکی کاریزما بە بەرزترین پلەی سەرنجڕاکێشی و کاریگەربوونی پۆزەتیڤ دروست دەکات. واتە کەسایەتییەك کە بە کۆکردنەوەی شوێنکەوتە و هەوادارانی سەرسەخت، بۆ گەورەترین گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەی مرۆییدا ئامادە دەکات.

# پاشا و وەزیرەکەی

پاشایەکی دەسەڵاتخواز هەبوو کە وەکو زۆرێك لە داگیرکەرانی دنیا ئاواتێکی نەبوو جگە لە فراوانکردنی ناوچەی دەسەڵات و حکومەت و فەرمانڕەواییەکەی و پاراستنی کۆلۆنییەکانی...

پاشا وەزیرێکی ژیر و بەدڵی هەبوو کە دواجار پاش ماوەیەکی زۆری تێڕامان و کێشمەکێشی دەروونی و ململانێ لەگەڵ نەفسدا بڕیاریدا واز لە پۆست و پێگەی حکومی بێنێت و بچێتە پاڵ شوێنکەوتووانی تەریقەت و ڕێگای ڕاستی لەپێناو ماریفەتدا.

وەزیری ماندوو لە گەمە سیاسییەکان لە چیاکانی نزیك پایتەختی ئیمپراتۆری، گۆشەی خەڵوەتی هەڵبژارد و بە تێڕامان و وردبوونەوە پرژایە سەر حاڵی خۆی و حەقیقەتی بوون و ژیان...

پاشا ناچار جێگرەوەیەکی بۆ وەزیر هەڵبژارد بەڵام ئەو هەرگیز نەیتوانی کاروبار وەکو وەزیرەکە ڕاپەڕێنێت و هەلومەرجەکە بەجۆرێك بەرەوپێش چوو کە جڵەوی کارەکان لە دەست پاشا دەرچوو. پاشا چەندەها جار پەیامی بۆ وەزیری پێشووی نارد و بە بەڵێن و گفتی زۆر هەوڵیدا وای لێبکات تا بگەڕێتەوە دنیای حکومەت و سیاسەت. پاشا ئەقڵی نەیدەبڕی چۆن مرۆڤ دەتوانێت چاو لەو هەموو پارە و سامان و پۆستە حکومییە بپۆشێت و ژیانی سەخت و ناخۆشی بگرێتە بەر. دواجار پاشا خۆی نەگرت و بڕیاریدا خۆی بچێتە خەڵوەتگای وەزیری پێشووی و ڕازی ئەم گۆڕانی بارودۆخە و گۆڕانی خۆی بزانێت...

ئەو لەگەڵ یاریدەدەر و دەست و پێوەندەکانی ڕێگای سەختی جیاکانی گرتەبەر و بە ماندووبوونێکی زۆرەوە گەیشتە شوێنی نیشتەجێبوونی وەزیری پێشوو و شوێنکەوتەی تەریقەت. ئەوی لە هەیبەتێکی تازە و گۆڕاودا بینییەوە. ئارامی و هەیبەتێکی تایبەت لە ڕوخساری شوێنکەوتە ڕۆحانییەکەدا دەرکەوتبوو. بەپێچەوانەی سەردەمی پێشوو کە کاتێك وەزیر چاوی بە پاشا دەکەوت دەست و پێی خۆی ون دەکرد و بە دەستەوستانییەوە ڕێزێکی بەرانبەر پاشا دەنواند و ئامادەی بیستنی فەرمانەکانی دەبوو، ئەمجارەیان دۆخەکە گۆڕابوو...شوێنکەوتە ڕۆحانییەکە بە دڵنیاییەوە لەسەر زەوی دانیشتبوو و ئەمجارە ئەوە پاشا بوو کە سەری سوڕمابوو. پاش ماوەیەك ئەحواڵپرسی و گفتوگۆ، پاشا پرسیارەکەی کرد:

—زۆر حەز دەکەم بزانم ئەم گۆڕانە لە ژیانتدا چ دەستکەوت و بەرهەمێکی بۆ تۆ هەبووە؟ چ شتێك بووەتەهۆی ئەوەی کە دەست لە پۆستە حکومییەکان بکێشیتەوە و ژیان لەم شوێنە دوورەدەستە هەڵبژێریت و نیشتەجێبوون لە کۆشکی پاشایەتی بەو هەموو ئیمکانات و تەشریفاتە ڕەت بکەیتەوە؟ ئایا بە ڕاستی ئەم گۆڕانکارییە سوود و حیکمەتێکی تێدایە؟

—پیری بەویژدان، لەکاتێکدا کە بە ئارامی سەری خۆی دەلەقاند، وتی: گەورەترین گۆڕانکاری کە ڕوویداوە ئەوەیە کە لە ژیانی پێشوومدا من دەهاتمە حزووری تۆ و گوێڕایەڵی فرمانی تۆ بووم...بەڵام ئێستا ئەوە تۆیت کە سەختی ئەم ڕێگایەت گرتووەتەبەر و تاوەکو بێیتە حزووری من و بمبینیت..

هێزی پۆست و پایە گرنگترین ستراتیژی کەسانی زاڵبوونخوازە بۆ گەیشتن بە بەکێشکردن و کۆنترۆڵکردنی هەلومەرج و کەسەکان (ئەو ڕێکارانەی کە لەلایەن پاشاوە هەڵبژێردرابوون). لەکاتێکدا کە کەسانی خاوەن هێزی ناوەکی (وەزیری دەست لەکارکێشاوە) بە تەرکیز و تێڕامان لە خود(بوون) دەگەنە گەشە و

گەشانەوە کە نائاگایانە، بەرزترین پۆست و پایەی بەکێشبوون و کاریگەربوونی دەداتێ.

لەلایەکی ترەوە سەرنجڕاکێشی ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو سەرچاوەیەی هێز (ناوەکی و دەرەکی) و پیشانی دەدات کە ستراتیژی (بوون) چۆن ڕوانگەی (هەبوون) دەخاتە ژێر ڕۆشناییەوە.

دواتر، بەهۆی سەرنجڕاکێشی بابەتەکەوە، باسی دوو چیرۆکی تر دەکەم تا تێبگەیت هێزی چۆن هێزی ڕەسەن و ڕاستەقینە دەتوانێت بەرزترین هێزە ڕواڵەتی و دەرەکییەکان بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و ناچاری ملکەچکردنیان بکات لەبەرانبەر هیبەتی ڕەسەنی خۆیدا.

# ناسرەدین شا و مەلا هادی سەوزەواری

ناسرەدین شا لە سەفەرە بەناوبانگەکەیدا بۆ خوراسان، دەچووە هەر شارێك وەکو پێشوو، هەموو چینەکان دەچوونە پێشوازی و دیدەنی و لەکاتی جێهێشتنی ئەو شارەدا بە گەرمی بەڕێیان دەکرد تا گەیشتە سەوزەوار.

لە سەوزەواریش هەموو چینەکان دەهاتنە پێشوازی و دیدەنی، تاکە کەسێك کە بە بیانووی گۆشەگیری و خەڵوەتنشینی نەهاتە پێشوازی و بینینی، حەکیم و فەیلەسوفی عاریفی ناسراو (حاجی مەلا هادی سەوزەواری) بوو. بەڕێکەوت تاکە کەسێك کە شا لەبەرچاوی بوو تا بەدرێژایی سەفەری خوراسان لە نزیکەوە ببینێت. هەر ئەم پیاوە بوو کە پەیتا پەیتا ناوبانگی سەراپاگیری لە هەموو ئێراندا پەیدا کردبوو.

پاشا کە لەو هەموو پێشوازی و دیدار و کڕنوش بردن و ماستاوکردنە بێتاقەت ببوو بڕیاریدا خۆی بچێتە دیدەنی حەکیم.

بە پاشایان وت: (حەکیم شا و وەزیر ناناسێت).

پاشا وتی: (بەڵام پاشا حەکیم دەناسێت).

مەسەلەکەیان گەیاندە حەکیم، کاتی دیاریکراو راگەیەنرا و ڕۆژێکیان نزیکی نیوەڕۆ، شا تەنیا لەگەڵ خزمەتکارێکدا چووە ماڵی حەکیم. خانوویەکی بچوك بوو بە کەرەستە و پێداویستی زۆر سادەوە.

پاشا لەکاتی دیدار و وێڕای قسەکردن لەگەڵ حەکیم وتی: (هەر نیعمەتێك شوکرێکی هەیە، شوکری نیعمەتی زانست، وانە وتنەوە و ڕێنماییە. شوکری نیعمەتی دارایی، دەستگرتنە. هەڵبەت شوکری نیعمەتی دەسەڵاتیش

جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی خەڵکە. بۆیە من حەز دەکەم تۆ داوای شتێك لە من بکەیت تا ئەنجامی بدەم).

مەلا هادی لە وەڵامدا وتی: (من پێویستم بە هیچ نییە، هیچم ناوێت).

ناسرەدین شا وتی: بیستوومە تۆ زەوییەکی بەپیتت هەیە، ڕێگە بدە فرمان بدەم ئەو زەویە لە باج ببەخشرێت).

مەلا هادی لە وەڵامدا وتی: (لە ئۆفیسی باجەکانی دەوڵەتدا تۆمار کراوە کە لە هەر شارێك چەنێك بگات، بنچینەکەی بە وردە گۆڕانکاریی تێك ناچێت. ئەگەر لەم شارەدا باج لە من نەسێنن، هەر ئەو بڕە پارەیە لەوانیتر وەردەگرن بۆئەوەی ئەو بڕە کە پێویستە لە سەوزەوارەوە بگات تەواو ببێت. با پاشا رازی نەبێت بەوەی کە کەمکردنەوەی باج بۆ من یان لێخۆشبوونم ببێتەهۆی بارقورسییەك بەسەر هەتیو و بێوەژن. سەرباری ئەمەش، دەوڵەت کە ئەرکی لەسەرە گیان و ماڵی خەڵکی بپارێزێت، خەرجیشی هەیە و دەبێ دابین بکرێت. ئێمە بە ڕەزامەندی و ئارەزوو، خۆمان ئەم باجە ئەدەین).

پاشا وتی: (حەز دەکەم ئەمڕۆ لە خزمەتی تۆدا نان بخۆم و هەر لەو خواردنەی ڕۆژانەی تۆ بخۆم، فرمان بدە خواردنی نیوەڕۆت بهێنن).

دەستبەجێ سێتێکی تەختەیان هێنا کە چەند پارچە نان و چەند کەوچك و دەفرێك دۆ و بڕێك خوێی لەسەر بوو و لەپێش حەکیم و پاشایان دانا. حەکیم بە پاشای وت: (بخۆ کە نانێکی حەڵاڵە، کشتوکاڵی عەرەقی ناوچەوانمە).

پاشا کەوچکێکی خوارد بەڵام بۆی دەرکەوت کە لەگەڵ ئەم خواردنەدا ڕانەهاتووە و پێی وایە قابیلی خواردن نییە، مۆڵەتی لە حەکیم خواست کە کەمێك لەو نانە بە دەسەسڕ ببێچێتەوە و وەکو نیشانەیەکی پیرۆزی لەگەڵ خۆیدا ببیات. پاش چەند ساتێك، پاشا بە دنیایەك سەرسوڕمانەوە ماڵی حەکیمی جێهێشت.

# ئەسکەندەر و دیۆجین

ڕۆژێکیان ئەسکەندەری گەورە (گەورە بە پێی پێوەرەکانی هێزی ناوەکی)ی فەیلەسوفی سەردەمی خۆی، دیوجینی بۆ کۆشکی خۆی بانگ کرد. دیۆجین وەڵامی نامەبەرەکەی ئەسکەندەری دایەوە:

(بە ئەسکەندەر بڵێ هەر ئەو شتەی کە ڕێگرە لەوەی کە تۆ بێیتەماڵم (سەڵتەنەت و بێ نیازی) هەر ئەو شتەش(قەناعەت و بێ نیازی) ڕێگرە لە هاتنم بۆ کۆشکی تۆ).

ئـــــەی بەتوانا دڵی دەروێشی خۆت وەدەست بێنە
کە مەخزەنی ئاڵتون و گەنجینەی رەونەقدار نامێنێ
(حافز)

## هێزی دەستکەوت(ی دەرەکی): سامان مرواری

پیری بەویژدان لەکاتی پەڕینەوە لە رووبارێـک، بـەردێکی زۆر گرانبـەهای نایـابی دۆزییەوە. هەڵیگرت و خستیە ناو کیسەکەیەوە. لە درێـژەی سـەفەرەکەیدا چاوی بە رێبوارێکی برسی و تینوو کەوت. پێشنیاری کرد کە پێکەوە نان بخۆن. ئـەوەی کە لـە کیسـەکەیدا هـەبوو هێنایـە دەرەوە و لەسـەر سفرەکە داینـا. لـەم میانـەدا کابرای برسی بەردە گرانبـەهاکەی بینی و دەستیکرد بە پیاهەڵگوتنی بەردەکە.

پیری بەویژدان کە تامەزرۆیی کابرای بەدی کرد وتی: (دەکرێ ئەم بەردە ببێتـە هی تۆ، ئەگەر ئەوەندە کەیفت پێ دێت).

پیاوەکـە بـاوەڕی نـەدەکرد بـەوەی کـە پیرەمێـرد وەهـا بـە ئاسـانی بـەردێکی گرانبەهای بداتێ، بەردەکەی وەرگرت و دەستبەجێ لەوێ دوور کەوتەوە.

پیاوەکە پێی وابوو کە بە بەدەستهێنانی سامانێکی وەها ژیانی خۆشگوزەرانی بۆ خۆی و خێزانەکەی دابین بکات. ئەو پاش چەند رۆژێك گەڕایەوە لای پیری دانـا لە دارستان و بەردە گرانبەهاکەی دایەوە.

ئەو وتی: ئەی پیری دانا، کاتێك تۆ ئەو بەردەت دامێ، چوومە لای خێزانەکەم و بابەتەکەم بۆ گێڕانەوە. لە سەرەتادا ئارامیم نەما چونکە زۆر نیگەران بووم مـەبادا کەسێك بەم بەردە بزانێت و بیەوێ لێمی بدزێت.

من و خێزانەکەم ڕۆژ و شەو سەرقاڵی پاسەوانیکردنی بووین، چیتر نە دەچووینە شوێنێك و نە ڕێگەشمان دەدا کەس بێت ماڵمان...بەرانبەر هەمووان ڕەشبین ببووین و لەلایەکی ترەوە لەناو منداڵەکانمدا لەسەر چۆنێتی فرۆشتنی و سوودوەرگرتن لە پارەکەی ناکۆکی دروست بوو. هەر کەسە شتێکی ئەوت. تەنانەت لەسەر ئەم بەردە لەنێوان خۆم و ژنەکەشمدا دەمەقاڵێی زۆر دروستبوو. پاش چەند ڕۆژێك کاتێك چاوم کردەوە بۆم دەرکەوت کە ئارامی و شادی لە ماڵەکەم باری کردووە و چیتر سۆز و خۆشەویستی لەنێوان ئەندامانی خێزانەکەم و کەس و کارم و دراوسێکانمدا نییە.

بڕیارمدا ئەمڕۆ بەردەکە بۆ تۆ بگەڕێنمەوە. بەڵام شتێکی تر هەیە کە دەمەوێ بیزانم و ئەویش ئەوەیە کە بۆچی تۆ وەها بە ئاسانی دەستبەرداری ئەم بەردە گرانبەهایە بوویت و هۆکاری وابەستە نەبوونت بەم بەردە و مادە چییە؟

سەرنج: هەرچەندە دارایی و پارە بەو ڕادەیەی کە پێداویستییەکانی مرۆڤ تێر بکات پێویستە بەڵام پشتبەستن و بایەخدانی لەرادەبەدەر بۆ بەدەستهێنانی پێگە و دەسەڵات و هێنانەکایەی ئاسایش، تاکەکەس بەرەو جۆرێك لە وابەستەیی ئاڵودەبووانە ئاراستە دەکات.

ئەم وابەستەییە، تکا، تەمەننا، مکوڕی و تینوێتی دەهێنێتە کایەوە و دەڵێن: چاوچنۆك چاوی پڕ نابێتەوە. بەتایبەت کاتێك گرێی هەبوونی دارایی زیاتر، تاکەکەس بەرەو دەست درێژکردن بۆ دارایی ئەوانیتر ناچار دەکات و کەسی پەیوەست بە مادە دەخاتە بەردەم ئەوانیتر.

## ستەم نامەی کەنارەگیریی پاشاکان بوو

**فیردەوسی**

زاڵبوون و کۆنترۆڵ لە ڕێگەی پارەوە، پایەدار و قووڵ نییە. چونکە پارە دڵی ئەوانیتر ناکڕێت. بەڵکو کەسەکان ناچار دەکات بۆ گەیشتن بە ئاسایشی دارایی ملکەچی تۆ بن و بەپێی خواستەکانی تۆ ڕەفتار بکەن. ئەم پەیڕەوییە تا ئەو کاتە بەردەوام دەبێت کە لە هاوکاریی تۆ سوودمەند ببن، واتە خاسیەتی کاتیبوونی هەیە.

لەبەرانبەردا، بێبەریبوون و پاکی، جوانیی کاریگەربوون بە مرۆۆ دەبەخشن. بەتایبەت کە دەرەنجامی سروشتیی وابەستە نەبوون، دەست والآیی و ڕۆحیەتی بەخشندەییە کە تاکەکان دەکاتە هۆگر و مورید کەسانی بەخشندە. بەخشندەبوون سەرەتای بەخشندەییە.

**نیازمەندی هەر کەسێك بیت ئەبیتە بەندەی ئەو**
**لە هەر کەسێك بیٚ نیاز بیت وەکو ئەو دەبیت**
**و بەخشش بدەیتە هەر کەسێکیش دەبیتە فەرمانڕەوای ئەو**
**(ئیمامی عەلی)**

ڕواڵەتی جوان بە کەڵك نایەت ئەگەر وشەی
واتادارت هەیە بیهێنە

(مەولانا)

# هێزی دەستکەوت(ی دەرەکی): جوانی
# خاتوونی جوان و فریشتە

خاتوونێکی تەمەن ناوەند جەڵتە لێی داو دەستبەجێ بردیانە نەخۆشخانە. کاتێك لەژێر نەشتەری پزیشکدا بوو بەشێوەیەکی کرداری، مەرگی ئەزموون کرد. کاتێك بێ هۆش بوو فریشتەیەکی بینی.

لە فریشتەکەی پرسی: ئایا کاتی مردنم هاتووە؟

فریشتە لە وەڵامدا وتی: نا، تۆ ٤٣ ساڵ و ٢ مانگ و ٨ ڕۆژی تر دەرفەتت دەبێ. پاش بەهۆش هاتنەوە و باشبوونی تەواوەتی، خاتوون بڕیاریدا لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە. لەبەرئەوەی زۆرتر ئومێدی بە ژیان هەبوو، چەند نەشتەرگەرییەکی جوانکاری ئەنجامدا. نەشتەرگەری ورگ، نەشتەرگەری لوت، نەشتەرگەری برۆکان....تەنانەت ڕەنگی قژیشی گۆڕی.

بە کورتی لە خانمێکی تەمەن ناوەندەوە بوو بە خانمێکی گەنج!

پاش دوایین نەشتەرگەری، لە نەخۆشخانە دەرکرا. کاتێك ویستی بڕواتە ماڵەوە، لە شەقام دەپەڕییەوە کە بەر ئامبولانسێك کەوت و گیانی لەدەستدا!

کاتێك ڕووبەڕووی فریشتە مەرگ بووەوە پێی وت: من پێم وابوو دەڵێیت چل و چەند ساڵێکی تر وادەی مەرگم دێت؟ بۆچی هێشتت بکەومە ژێر تایەکانی ئامبولانس؟ بۆچی من مردم؟

فریشــتە لــە وەڵامــدا وتــی، ببــوورە کاتێــك لــە شــەقامەکە ئەپەڕیتــەوە نەمناسیتەوە !...

**سەرنج:** جەختکردنـەوە لـە جـوانیی جەسـتەیی ڕێگەچـارەیەکی دەرەکییـە بـۆ کاریگـەری دانـان. لەکاتێکـدا کـە بـۆ هـەبوونی پلـەی بـەرزتر و ڕاسـتەقینەتری کاریگەری، سەرنجڕاکێشی و هێزی کەسی پێویستە.

چەندەی مرۆڤ هێزی بڕوابەخۆبوون و زەنگینی کەمتری هەبێت، زیاتر پشت بـە ڕواڵەتە جەستەیی و دەرەکییەکانی جوانییەکەی دەبەستێت.

گاندی بە پارچە قوماشێکی دوولاوە لەبەرانبەر گـەورەترین ئیمپراتۆریـەتی ئـەو سەردەمە (بریتانیا) وەستایەوە...لەکاتێدا کە پیاو و ژنی زۆر دەناسـم کـە هـەموو بڕابەخۆبوون و هێزی خۆیان لـەو جلـەی کـە لەبـەری دەکـەن، لـەو ئارایشـەی کـە دەیکەن، لەو مۆدێلە قژەی کە دایدەنێن،...وەردەگرن.

ئەوان واسواسی نەخۆش ئاسا و پێداگریی زیادەڕەوانەیان هەیە لەسەر ڕواڵـەتی خۆیان بە جۆرێك کە بە هەبوونی بچوکترین کەموکوڕیی ڕواڵـەت، بڕوابـەخۆبوونیان لەدەسـت دەدەن و نـاتوانن لەبەرانبـەر ئـەوانیتردا بـە هێـزەوە بـوونی خۆیـان بسەلمێنن...

باوەڕ بکە بوونەوەرێکی جوان و بەهاداریت.

قەدری خۆت بزانە.

خۆت بناسە.

و بەو مەزنایەتی و گەورەیی و جوانییەی کە خالقی بوون بـە تـۆی بەخشـیوەوە، ئیمان بێنە.

# رازی سەرنج ڕاکێشبوون

کاترین خانمێکی ٨٠ ساڵانە کە وێڕای زۆریی تەمەن، زۆر سەرنجڕاکێش و دڵگیرە. ڕۆژێکیان لە ریزی فرۆشگاکەدا دراوسێکانی لێیان پرسی چی بەکار دێنێت کە روخساری ئەوەندە جوان و سەرنجڕاکێش و دڵگیرە. ئەویش بە بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

—بۆ لێوەکانم، راستگۆیی بەکاردێنم.

—بۆ دەنگم، میهرەبانی بەکاردێنم.

—بۆ گوێچکەکانم، هاوخەمی،

—بۆ دەستەکانم، چاکە،

—بۆ باڵام، خاکیبوون،

—بۆدڵم، بەزەیی و عەشق بەکاردێنم و....

یەکێك لە پیاوە مەزنەکان لە زانایەکی پرسی:

باشترین جۆرەکانی راو کامەیە؟

وتی: راوکردنی دڵی خەڵك، چونکە کە بتوانیت بیانخەیتە تەڵەوە، هەمیشە هی تۆ دەبن و لە هیچ شتێکدا دەردەسەریت بۆ دروست ناکەن.

# هێزی دەستکەوت(ی دەرەکی): شانازی بە بنەماڵە و باوك و پێشینە تۆ کێیت؟

دەگێڕنەوە نیوەشەوێك ناسرەدین شا لەگەڵ دوو کەس لە یاوەرانی ڕێیان کەوتە کاروانسەرایەك. بە توند لە دەرگایاندا و سەرپەرشتیاری کاروانسەرا لە خەو هەڵسا. هاواری کرد: کێیت؟ ئەوە تێکچوویت؟

ناسرەدین شا وتی: ئێمەین...سوڵتانی کوڕی سوڵتان، خاقانی کوڕی خاقان، سوڵتانی ساحێبقڕان، زەڵوڵلا، شاهەنشای ئێران، پاشای مەلیك و ڕەعیەت، ناسرەدین شای قاجار!

سەرپەرشتیاری کاروانسەرا وتی: ئێمە شوێنمان بۆ ئەو هەموو خەڵکە نییە!

لاوازی لە دەرەوەڕا سەرچاوە دەگرێت، لەکاتێکدا کە هێز پشت بەخۆی دەبەستێت و پێویستی بە خۆلکاندن بە ئەسڵ و نەسەب نییە:

ڕۆژێکیان شێخی ئێمە -ئەبوسەعید ئەبولخەیر- لە نیشابور بەرەو کۆڕێك دەچوو. هەندێ لە نازناو بێژان هاتن و داوایان لێکرا هەندێ نازناو بڵێن- کە نەریتێکی خۆیان بوو. کە شێخیان بینی سەریان سوڕما و زمانیان لاڵ بوو، نەیانزانی چی بڵێن.

لە موریدەکانی شێخیان پرسی: چ نازناوێك بۆ شێخ بڵێین؟

شێخ کە ئەو دەستەوستانییەی ئەوانی بینی وتی: (بچنە دەرەوە و هاوار بکەن و بڵێن ڕێگە بدەن هیچ کەسی کوڕی هیچ کەس با بێتە ژوورەوە).

نازناو بێژان چوونە دەرەوە و حوکمی ئامـاژەی شـێخ، هاواریـان کـرد: بـا هـیچ کەسی کوڕی هیچ کەس بێتە ژوورەوە.

هەموو گەورەکان سەریان هەڵبڕی. شـێخیان بـینی کـە دەهـات– هـەمووان بـەو دیمەنە دڵخۆش بوون.

تـۆ دەتووانیـت بـە خـایکبوون کاریگـەری لەسـەر ئـەوانیتر دانێیـت نـەك بـە لوتبەرزی.

# هێزی دەستکەوت (ی دەرەکی): پایە و ڕواڵەت پەرستی لەبەرکردنی جلی پینە و دڕاو

پیاوێك چووە لای شێخ ئەبولحەسەن خرقانی و پێی وت:

(شێخۆ! دەمەوێ جلی شڕ لەبەر بکەم!)

شێخ وتی:

(پرسیارێك هەیە لێتی بپرسم کە ئەگەر وەڵام بدەیتەوە ئەوا شایستەی جلی شڕیت).

پیاوەکە قبوڵی کرد و ئامادە بوو بۆ بیستنی پرسیارەکە.

شێخ وتی:

(ئەگەر پیاو عەبای ژنێك بپۆشێت، دەبێتە ژن؟)

کابرا وتی: (نەخێر! یا شێخ!)

شێخ پرسی: (ئەگەر ژنیش جامانەی پیاوێك لەسەر نێت، قەت دەبێتە پیاو؟)

پیاوەکە لە وەڵامدا وتی: (نا، نا! یا شێخ!)

شێخ ئەبولحەسەن خەرقانی دوای ئەم پرسیار و وەڵامە بە پیاوەکەی وت: ئەی ڕاگوزەر! تۆش ئەگەر لەم ڕێگەیەدا تۆش وەها ڕەفتار بکەیت ئەوا بە پۆشینی شڕە جل نابیتە پیاو.

به شنه بایەك دەفتەری رۆژگار پەرت و بڵاو
دەبێ لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر پەڕەیەك شەو و
رۆژ تێفکرە و بیرت بێ

(سائیب تەبریزی)

# رەخنەیەك لە سەرچاوەی هێزی دەرەكی (١) چەرخی رۆژگار

کە عومەری کوڕی لەیس و ئیسماعیل سامانی لە (بلخ) گەیشتنە یەکتری، جەنگ دەستی پێکرد. عومەری کوڕی لەیس لەم جەنگەدا شکستی هێنا. حەفتا هەزار سوارچاکی ئەو رایانکرد و یان بە دیل گیران. عومەریش لە مەقەڕی ئیسماعیل سامانیدا بەند کرابوو.

دەمەو ئێوارەیەك کەسێك کە خزمەتگوزاری عومەری کوڕی لەیس بوو و لە مەقەڕەکەدا دەگەڕا، چاوی بەو کەوت و دڵی پێی سوتا و چووە لای. عومەر پێی وت: ئەمشەو لای من بە کە زۆر تەنیام. خزمەتگوزارەکە برێك گۆشتی دەستکەوت لەگەڵ مەنجەڵێك و چەند پارچە دارێك تا خواردنێك ئامادە بکات.

تا گۆشتەکەی خستە ناو مەنجەڵەکە و خۆی چووە سۆراخی خوێ، شەو داهات. سەگەکەی هات و سەرقاپەکەی لابرد و پارچە گۆشتێکی دەرهێنا. دەمی سوتا و دەستبەجێ سەری بەرز کردەوە. مەنجەڵەکە لەسەریدا گیری کرد و لەتاو سوتانەکەی زۆر وەڕی.

عومەری کوڕی لەیس کە ئەو بارودۆخەی بینی، روویکردە سوپا و پاسەوانەکان، پێکەنی و وتی:

ببێتە پەند بۆتان. من مرۆڤێك بووك كە بەیانی زوو هەزار و چوارسەد وشتریان هێنایە مەتبەخەكەم و ئێوارە سەگێك هەڵیدەگرت و بردی! و وتی: بەیانی ئەمیر بووم و ئێوارە ئەسیرم.

یەكێك لە تایبەتمەندییە گرنگەكانی هێزی دەرەكی، ئەوەیە كە قابیلی دەستكەوتن بێت. لەبەرئەوەی هەموو شتێك كە دەستبكەوێت تایبەتمەندیی لەدەستدانیشی هەیە، سەرچاوە دەرەكییەكانی هێز بەزۆری ناجێگیر و كاتین، بە جۆرێك كە كەسانی پشت ئەستوور بەم سەرچاوانە دەخەنە ناو حاڵەتێكی رەشبینی، بەدگومانی و بارودۆخی هێرشبەرانەوە بەرانبەر تاكەكان. كەسانی دەسەڵاتخواز هەمیشە نیگەرانی لەدەستدانی ئیعتیبار و توانای كۆنترۆڵكردنیانن بۆیە هەمیشە ناهێمن، نادڵنیا و شڵەژاون.

ئەم نموونە مێژووییە بخوێنەرەوە. خرۆچۆف لەبارەی ستالین و رۆحیەتی هەراسان و ناجێگیری دەڵێت: ستالین هەر كاتێك لە كرێملین یان ماڵی خۆی دەچووە دەر وێڕای ئەوەی كە پەردەیان بەسەر جامەكانی ئۆتۆمبێلەكەیدا بەردابووەوە، بەڵام تەنانەت بۆ ساتێكیش ئاسودە نەبوو و بەردەوام سەیری دەوروبەری دەكرد. شۆفێری ئۆتۆمبێلەكەی هەرگیز پێشتر نەیدەزانی لە كام جادە و شەقامانەی شارەوە رەت ببێت.

لە ساڵانی دوایی تەمەنیدا، شەوان لە یەك شوێن نەدەخەوت. ئەو چەند شوێنێكی بۆ خەوتن ئامادە كردبوو و جگە لە خۆی كەس نەیدەزانی لە كوێ دەخەوێت و ئەو خەیاڵەی كە دەیانەوێ بیكوژن، ئارام و ئۆقرەی لێ بڕیبوو و ژمارەیەكی زۆری كەسانی تەنیا لەبەر ئەوە لەناوبرد كە پێی وابوو دەیانەوێ بیكوژن.

تەڵەبی مەنسەب خاوەن ئەقڵ ناکاتە ئەمر

(سەعدی)

## چوار ڕۆژ مەودا

پیاوێك ڕێگەی کەوتە دیوانی ژمێریاریی هارون. دەفترێکی کردەوە. لە یەکێك لە لاپەڕەکاندا نوسرابوو: چوارسەدهەزار دینار بۆ کڕینی پۆشاکی جەعفەر بەرمەکی (ی وەزیری ئێرانیی هارون ئەلرەشید).

لاپەڕەکانی دەفتەرەکەی هەڵدایەوە. لە لاپەڕەیەکی تردا نوسرابوو: دە قیرات بۆ کڕینی چنراوی گەڵای خورما بۆ سوتاندنی تەرمی جەعفەر بەرمەکی. مێژووی ئەم دوو نوسراوەی بەراورد کرد. تەنیا چوار ڕۆژی بەین بوو.

# رەخنە لە سەرچاوەی هێزی دەرەکی(٢)
# ئەفسەر و شۆفێری گێل

شـۆفێرێکی گێـل بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی تـابلۆی هاتوچـۆی (هاتنــە نـاوەوە قەدەغەیـە)، هاتـە نـاو شـەقامێکەوە.لە کۆتـایی شـەقامەکەدا ئەفسـەری هاتوچـۆ چاوەڕێی دەکرد. ئەفسەر پێی وت: بەڕێز، تۆ تابلۆی هاتوچۆت نەبینی؟

شـۆفێر بـە شـەرمەزارییەوە وتـی: بۆچـی قوربـان، تابلۆکـەم بـینی بـەڵام تـۆم نەبینی.

یەکێك لە کەموکوڕییەکانی تری روانگەی کۆنترۆڵی دەرەکـی ئەوەیـە کـە هێـزی زاڵبوونی تۆ تا ئەو کاتەی کە ئامادەییت هەیە و بەکاری دێنیت، کاریگەرە. تا ئـەو کاتەی کە ئامادەییت هەیە کارمەندەکانت کار دەکەن.

تا ئەو کاتەی کـە پاداشـت ئـەدەیت منداڵـەکانت رەفتـار دڵخـوازی تـۆ لـەخۆیان پیشان دەدەن.

تـا ئـەو کاتـەی کـە کـۆنترۆڵ ئاراسـتە دەکـەیت، هاوسـەرەکەت لـەژێر دەسـتی تۆدایە.

تا ئەو کاتەی کە هەڕەشە دەکەیت هاوڵاتیانت ناچارن ملکەچ بکەن.

تا ئەوکاتەی کە جوانیت و پارەت هەیە و یان لە پێگەیەکی گونجاو دایـت رێـزت دەگرن.

(تا پارەت هەیە هاوڕێتم...)

هەر کە ئامرازی کۆنترۆڵ و زاڵبوو نەمان تۆ هێزی خۆت لەدەست دەدەیت.

سەرۆك: بۆچی ئیش ناکەیت؟

کارمەند: ئاخر نەمزانی تۆ لەم ناوەیت!

***

لە ماڵی فەرمانڕەوایەکدا مەراسیمی خوێندنەوەی وتاری ماتەمینی بوو. یەکێك لە کۆنە ماستاوچییەکان هاتە کۆڕەکە و بێ باکانە پشتی کردە مینبەر و لەبەرانبەر فەرمانڕەوادا ئەژنۆی دادا و دەستیکرد بە پیاهەڵدان.

فەرمانڕەوا ویستی تێی بگەیەنێت کە پشتی لە مینبەرە. بەڵام ئەو دەنگی بەرزتر کردەوە و وتی: مینبەر و قیبلەی ئێمە تۆی پایەبەرزیت!

هەر لەو وەختەدا هەواڵی ئەوە گەیشت کە فەرمانڕەوا لەسەر کورسی لابراوە، دەستبەجێ رووی بەلای مینبەرەکەدا وەرگێڕایەوە، پشتی کردە فەرمانڕەواکە و وتی: (پشتکردنە مینبەری حەزرەتی سەیدولشوهەدا لە خراپترین بەڵاکان و ئەوپەڕی بێ ئەدەبییە).

## ب:ستراتیژییەکانی کاریگەری دانان(١)
## بەڵگەی حاشاهەڵنەگر

ئیمامی فەخر ڕازی لەلایەن دوژمنەوە بەوە تۆمەتبار کرا کە لەسەر ڕێبازی ئایینزای ئیسماعیلییە. ئیمام چووە سەر مینبەر و بۆ بێبەریکردنی خۆی لەو تۆمەتە نەفرەتی ئاراستەی ئەو تایفەیە کرد. ڕۆژێکیان لە خەڵوەتدا، یەکێك لە قوتابییەکان ریشی گرت و خەنجەرێکی لەسەر سنگی دانا.

فەخر رازی دەستیکرد بە پاڕانەوە و لە هۆکاری ئەو نیازخراپییەی پرسی. قوتابییەکە وتی: دەبێ لەمەودا نەفرەت ئاراستەی ئیسماعیلییە نەکەیت.

ئیمام سوێندی خوارد کە بە قسەی بکات. لەم کاتەدا قوتابییەکە کیسەیەك ئاڵتونی لای ئەو دانا و وتی: ئەمە سێسەد و شەست دینار ئاڵتونە کە هەموو ساڵێك پێت ئەگات.

کاتێك لە ئیمام فەخر رازییان پرسی بۆچی هەوڵ نادەیت وەڵامی عەقیدەی ئیسماعیلی بدەیتەوە؟ بە خەندەیەکەوە وتی: کاتێك بەڵگەی حاشاهەڵنەگریان (واتە خەنجەر و کیسە ئاڵتون)م بینی، تێگەیشتم کە بێدەنگی لەبەرانبەر ئەم تایەفەیەدا باشترە. خاڵی لاواز بەهۆی لەدەستدانی هێزی ناوەکی سوود لە (هەڕەشە) و تەنانەت بزواندنی چاوبرسێتی و پاداشت وەردەگرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی تاکەکان و گەیشتن بە مەبەستە دڵخوازەکان.

ئەگـەر ورد بینــەوە بۆمـان دەردەکـەوێت چـۆن چـۆنی بـە درێـژایی ڕۆژ لـە پەیوەندییـە مرۆییەکانـدا بـۆ کـۆنترۆڵکردنی تاکـەکان هەڕەشـە دەکـەین و یـان دەکەوینە بەر هەڕەشە.

پێش چەند ڕۆژێك، کوڕەکەم (شایان)ی حەوت ساڵان لەگـەڵ کـوڕە مامەکەیـدا سـەرقاڵی یـاریکردن بـوو و هـەر جارێـك کـە بـە گـوێرەی خواسـتی نەدەجوڵایـەوە دەیگوت: عەلی، ئەگەر وەها نەکەیت قسەت لەگەڵ ناکەم.

مەخابن چەکی هەڕەشە بەهۆی کاریگەرییە بابەتی و خێراکەی (هەڵبـەت کـەمتر ئەنجامە نێگەتیڤـەکانی بـەدی ئەکـەین) بووەتـە ئـامرازێکی چالاك لـە پەیوەنـدیی نێوان کەسەکاندا و هەمووان، هەر لە منالێکەوە تا گەورەیەك، فێری ئەوە بوون کە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەوانیتردا کەڵکی لێوەرگرن.

ترس و بزواندنی چاوبرسێتی، دوو ئامرازی لاوازین بۆ کۆنترۆڵکردنی کەسەکان.

**ئاسمان بۆ گـرتنی مانـگ تـەڵە نانێتەوە**

**سـەربەسـتی مانگە کە ئەو پابەند دەکات**

**(رابیندرانات تاگور)**

**هونەر ئەوە نییە کە راوچی بچێتە دوای نێچیر**

**هـونەر ئەوەیە کە نێچیر دوای راوچی بکەوێت**

# چ شتێك درێژە بە پەیوەندییەکان دەدات

رۆژێکیـان ژن و مێردێـك ئاهـەنگی بیسـت و پێنجـەمین سـاڵوەگەڕی هاوسەرگیرییەکەیان گێڕا. ئەوان لە شاردا ناسراو بوون چونکە بەدرێژایی ٢٥ ساڵ بچوکترین ناکۆکییان لەگەڵ یەکتریدا نەبوو. لەم مەراسیمەدا سەرنوسەری رۆژنامە لۆکاڵییەکان کۆ ببوونەوە تاوەکو هۆکاری بەناوبانگبوونیان (رازی بەختەوەرییان) بزانن.

سەرنوسەر دەڵێت: بەڕێز، بە راستی جێگەی باوەڕ نییە؟ چۆن شتی وا دەبێت؟

پیاوەکە رۆژانی مانگی هەنگوینی دێنێتەوە یاد و دەڵێت: دوای هاوسەرگیری بۆ مانگی هەنگوینی چووینە باکوور. لەوێ بۆ ئەسپسواری، دوو ئەسپی جیاوازمان هەڵبژارد. ئەو ئەسپەی من هەڵمبژارد باش بوو. بەڵام ئەسپی هاوسەرەکەم کەمێك سەرکێش بوو.

لەکاتی ئەسپسواریدا لەپڕ بازیدا و هاوسەرەکەمی لە زینەکە بەردایەوە. هاوسەرەکەم خۆی رێکخستەوە و لە پشتی ئەسپەکەی دا و وتی: (ئەمە یەکەم

جارتـه) پاش چـەند خولـەکێك دووبـارە هـەمان شـت روویدایـەوە. ئـەمجارە هاوسەرەکەم بە هێمنی سەیرێکی ئەسپەکەی کرد و وتی: (ئەمـە دووەم جارتـە) و پاشان سواری ئەسپەکە بووەوە و کەوتینە رێ.

کاتێك ئەسپەکە بۆ سێیەمین جار هاوسەرەکەمی بەردایـەوە، هاوسـەرەکەم زۆر بە هێمنی تفەنگێکی لە کیفەکەی هێنایە دەر و بە هێمنی تەقەی کرد و ئەسپەکەی کوشت. بەسەر هاوسەرەکەمدا هاوارم کرد و وتم: (ئەوە چیت کرد نەخۆش، شـێت بوویت؟ بۆچی ئەو بەستەزمانەت کوشت؟)

هاوسەرەکەم سەیرێکی کردم و وتی: (ئەمە یەکەم جارتە!)

بۆ بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی ئەوانیتر یـان دەبـێ بیانخەیتـە ژێـر کاریگـەریی خۆتەوە یان بە سوودوەرگرتن لە (ترس) و هەڕەشە کۆنترۆڵیان بکەیت.

کەسانی بەهێز و بەکێشکەر پێویستیان بە کۆنترۆڵکردنی ئەوانیتر نییە، چـونکە کەسایەتی و هێزی ناوەکییان کەسەکان رێنوێنی دەکات. بەڵام کەسانی لاواز و بێ بنچینە لەبەرئـەوەی وزەی هێـز و کاریگـەری دانانیـان نییـە ناچـارن بـە بزوانـدنی چاوبرسێتی و هەڕەشە مل بە تاکەکان کەچ بکەن.

خودای عاریفەکان ئەوەندە بەکێشکەرە کە عاریفێك بەرەو خۆی بەکێش بکات.

بەڵام خودای وشکە پیرۆزەکـان تـەنیا بـە بزوانـدنی چاوبرسـێتی (بەهەشـت) و هەڕەشە (دۆزەخ) دەتووانێت کەسەکان کۆنترۆڵ بکات.

لە راستیدا لە هەندێ لە ئایینەکاندا روانین و گەڕانـەوە بـۆ خـودا لەبـەر خـاتری ئـەوەی کـە هەیـە، روودەدات. خـودا ئەوەنـدە بەکێشـکەرە کـە وەکـو دۆسـتێك و

مەعشوقێك لێی دەڕوانرێت. بەڵام لە ئایینەکانی تردا خودا پێی دەوترێ خودا و لە میحراب و پەرستگاکاندا لەبەر خاتری ئەوەی کە هەیە ناوی دەبیسترێت (بەهەشت). هاوڵاتیانی فەرمانڕەوای بەهێز ڕێزی لێ دەگرن و بە گەرم و گوڕییەوە خۆشەویستی بۆ دەردەبڕن.

بەڵام هاوڵاتیانی رابەری لاواز و ترسنۆك بە تۆقاندن و سەرکوتکردن ڕێبەرایەتی دەکرێن.

لە کۆمەڵگەیەکدا کە فەرمانڕەواکانی لاواز بن و لەبەرچاو نەبن، ئامرازی سەپاندن، هەڕەشە و زەبروزەنگ بۆ کۆنترۆڵکردنی رەفتاری هاوڵاتیان دەگیرێتە بەر.

کرێکاران و کارمەندانی بەڕێوەبەر و رابەرێکی رەسەن، بە دڵ و بە گیان کاری بۆ دەکەن، بەڵام لە بەڕێوەبردنی بونیادنراو لەسەر کۆنترۆڵی دەرەکی کارمەندان و کرێکاران تا ئەو کاتەی کە سەرۆك ئامادەیی هەبێت سەرقاڵی کارن.

لە پەیوەندییەکی بونیادنراو لەسەر عەشق، هێزی بەکێشکردنی دوولایەنە، دوو کەسەکە لە پەیوەندییەکدا دەهێڵێتەوە. بەڵام لەو پەیوەندییانەدا کە خۆشەویستیی تێدا نییە، پیاو و ژن دەست دەدەن کۆنترۆڵیش. ترسی لەدەستدانی لایەنی بەرانبەر دەبێتەهۆی هێنانەکایەی سنووربەندی و کۆنترۆڵکردنی توندی رەفتارەکانی یەکتری.

دەبێ هاوسەران بە هێـزی سەرنجڕاکێشـی و هێـزی نـاوەکی مەعشـوقی خۆیـان بپارێزن یان دەبێ سوود لە ئامرازی کـۆنترۆڵی و چـاودێری– کـە سـنووربەندکەری ئازادیی مرۆییە– وەربگرن بۆ پاراستنی لایەنی بەرانبەر لە پەیوەندییەکدا.

تۆ چۆن چۆنی کاریگەری دەخەیتە سەر دەوروبەری خۆت؟

ئایا بەوەی کە هەیت یان لەبەر ئەو شتەی کە هەتە تۆیان خۆش دەوێت؟

سەرۆکایەتی بە دەستی کەسانێکی هەڵەوەیە

کە لە دەستیان دەستی زۆر بە ئاسمانەوەن

(سعدی)

## کورتە چیرۆکی ترس

ترس لە سیستەمی پۆلیسیی ستالین بە جۆرێك بوو کە لە کۆنفرانسەکانی حزبی کۆمەنیستدا پاش هوتاف مەزنکردن ستالین، بەشداران هەموویان هەڵدەستان و دەستیانکرد بە چەپڵەلێدان.

هیچ کەس ئازایەتی ئەوەی نەبوو یەکەمین کەس بێت کە چەپڵە بوەستێنێت. بۆیە چەپڵە کاتێکی درێژی دەخایاند. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە (زەنگ)ێك ئامادە کرا بۆئەوەی بە دەنگی زەنگەکە چەپڵەلێدان بوەستێت.

سەرنج: خاڵێکی گرنگ کە دەربارەی ئاراستەی هەڕەشە کە نابێ لێی غافڵ بین ئەوەیە کە دوو جۆر خودا بوونیان هەیە.

خودایەك کەتۆ دەترسێنێت تا تۆ بەرەو رێگای راست پاڵ بنێت و خودایەکی عاشق کە تۆی خۆش دەوێت و بەرەو رێگای راست رێنماییت دەکات.

ترس، مرۆڤ لە خراپە لادەدات بەڵام نایکاتە عاشقی چاکە. ترساندن، رەفتاری مرۆڤەکان دەگۆڕێت بەڵام تێڕوانینیان هەرگیز ناگۆڕێت. ترس نابێتە هۆی گۆڕانی ناوەوە.

تەنیا عەشقە کە دڵی مرۆڤ و بیرکردنەوەی دەگۆڕێت.

گۆڕانی دەرەکی (رەفتار) بە ترس و گۆڕانی ناوەکی (تێڕوانین) بە عەشق مەیسەر دەبێت.

بۆیە تا ئامرازی کۆنترۆڵکردنی هەڕەشە لابردرێت دووبارە رەفتار دەگەڕێتەوە سەر مۆدێلی پێشوو.

به نەرمی دەتوانیت دوژمن بکەیتە دۆست

(سەعدی)

# زمانی لە قورگی بێنە دەرەوە

ساموێل هاناجید، شاعیر و سیاسەتمەداری سەدەی یانزەهەمی زایینی ئیسپانیا بوو. ئەو دوژمن و رەخنەگری زۆری هەبوون. ماوەیەکیش سەرۆك وەزیرانی ئیسپانیا بوو. رۆژێکیان یەکێك لە دوژمنانی لەلای پاشا توندترین رەخنە و ئیهانەی ئاراستەی ئەو کرد.

پاشا لەو رەخنە و قسانەی کە ئاراستەی سەرۆك وەزیرەکەی کرابوو تەواو شێوا بوو. بەجۆرێك کە فرمانی بە ساموێل کرد زمان لە قورِی رەخنەگرەکە بهێننە دەرەوە.

بەلاّم ساموێل بە شێوازی خۆی ئەم فرمانەی جێبەجێ کرد. ئەو بە لوتف و میهرەبانییەوە لەگەلّ دوژمنەکەیدا رەفتاری کرد. پاشا لەبەرانبەر جێبەجێ نەکردنی حوکمەکەیدا زۆر سەری سوڕما. ساموێل لە وەلاّمدا وتی:

خاوەنشکۆ: منی پوچ فرمانەکەتم جێبەجێ کرد. واتە زمانی جنێودەرەکەم بڕی وَ لەبری ئەمە زمانی ستایش و دۆستایەتیم لە شوێنی دانا.

**سەرنج:** لەکاتێکدا کە زاڵبوونخواز بە چەکی هەڕەشە تاکەکان دەکاتە پاشکۆی خۆی، مەزنایەتی و جوانیی هێز لە دڵەکاندا پایەدار دەبێت و ئەوان بەلای خۆیدا بەکێش دەکات. ئەم هێزە ناوازەیەی بەکێشکردن، بە جۆرێکە دوژمن دەکاتە رەخنەگر و رەخنەگر دەکاتە دۆست.

له ئەسکەندەریان پرسی: بە ڕۆژگارێکی کەم چۆن ئەم هەموو مەملەکەتەت بەدەست هێنا؟

وتی: بە بەهاوڕێکردنی دوژمن و بە نەرمی پیشاندان و هێشتنەوەی هاوڕێیان لەسەر پەیمان.

دەگێڕنەوە پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو و چەندەها جار بە شێخ ئەبو ئیسحاق کازرۆنی دەوت شتێك لە دنیا قبوڵ بکات. ئەویش نەیدەکرد.

دواجار کەسێکی نارده لای شێخ: چەندین بەندەم بەناوی تۆوە ئازاد کردووە و خێرم کردووە.

شێخ وتی: ئایینی ئێمە بەندە ئازادکردن نییە، بەڵکو بەندەکردنی ئازادە بە نەرمی و ئارامی.

# لەگەڵ دۆستان نەرمی
# لەگەڵ دوژمنان هەڵکردن

والی شارێك نامەیەکی بۆ حاکمی وڵات نووسی: (بورج و بەربەستەکانی شار بەرەو خراپی چوون و بۆ پاراستنی گیانی هاوڵاتیان و هێنانەکایەی ئاسایش، پێویستە رەزامەندی بفەرموویت لە خەزێنە برە پارەیەك تەرخان بکرێت تا کاری چاککردنەوە بەخێرایی دەست پێبکەین.

حاکم لە وەڵامدا وتی: (کاری مەملەکەت ناگاتە سەرەنجام و هاوڵاتیان هەست بە ئاسایش ناکەن مەگەر ئەوەی کە دیوارێك لە توخمی دادپەروەری لە دەوراندەوری شار راست بکەیتەوە و ئەوەندە هەست بە ئازادی بکەن کە بە تەتەڵە (بەهۆی ترسەوە) لەگەڵ کارمەندانی حکومەتدا قسە نەکەن. ئەگەر وەها بێت چیتر پێویستبوون بە بونیادنانی هیچ دیوارێك و بەربەستێك ناکات.

## ستراتیژەکانی کاریگەری دانان: زمانلوسی و پیاهەڵگوتن
## ماڵی ئێمە باشترە یان ماڵی ئێوە؟

فەتح بن خاقان لە سەردەمی متوەکلی عەباسیدا پۆستی وەزارەتی هەبوو. ئەو شاعیرێکی رەوانبێژ و لەهەمان کاتدا زمان لوس و دەسەڵاتخواز بوو هەر جارێك کە پێگە و پایەی خۆی لەژێر مەترسیدا دەبینییەوە، قەسیدەیەکی درێژی لە ستایشی متوەکل دەهۆنییەوە و بۆی دەخوێندەوە.

باوکی ئەم شاعیرە هەر لە منالێیەوە لەسەر زمانلوسی و وتنی وشەی پەیوەندیداری بە پیاهەڵگوتن راهێنابوو. دەڵێن رۆژێکیان موعتەسەمی عەباسی لە رۆژگاری منالی(ی فەتح)دا چووە دیدەنی باوکی و بە گاڵتەوە وتی:

بڵێ بزانم ماڵی ئێمە باشترە یان هی ئێوە؟

فەتح دەستبەجێ لە وەڵامدا وتی: تا ئەو کاتەی تۆ لە ماڵی ئێمەیت، ماڵی ئێمە باشترە. موعتەسەم بەم قسەیە ئەوەندە دڵخۆش بوو کە فرمانی کرد سەدهەزار درهەمی بە دیاری بدەنێ.

زمانلوسی، زمان و ئەدەبیاتی زاڵبوونە. ئەدەبیاتێك کە بەداخەوە لە کتێبەکانی (بەدەستهێنانی سەرنجراکێشی)دا سوودی زۆری لێوەردەگیردرێت...بنچینەی پیاهەڵگوتن ئەوەیە کە تاکەکەسی زمانلوس دنیا نەك بەو شێوەیەی کە هەیە بەڵکو بەو شێوەیەی کە بەرانبەرەکە ئەیەوێت باس دەکات و دەردەبڕێت و ئەو شتەی کە لەم نێوەندەدا دەبێتە قوربانی حەقیقەتە.

لوئەی پانزەهەم، رۆژێکیان بەیانییەکەی لە یەکێك لە خزمەتگوزارانی کۆنی خۆی پرسی: چەند منالت هەیە؟

خزمەتگوزار لە وەڵامدا وتی: چوار.

ئەو ڕۆژە تا شەو لوئەی پانزەهەم دوو سێ جار ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوە و ئەویش هەموو جارێك، وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت: چوار. دەمی شەو، پاش خواردنی نانی ئێوارە، لوئەی پانزەهەم دیسان لێی پرسی: چەند منالت هەیە؟

پیاوەکە لە وەڵامدا وتی: شەش.

پاشا بە سەرسوڕمانەوە وتی: پێم وایە بە منت وتبوو چوار. وا نییە؟

پیاوەکە لە وەڵامدا وتی: بەڵێ، بەڵام لە ترسی ئەوەی کە مەبادا چەندجار دووبارەکردنەوە ببێتەهۆی سستبوونی بیرەوەری جەنابت، ئەمجارەیان وەڵامەکەم گۆڕی.

بەڵام تۆنی گوتار و ئەدەبیاتی کاریگەری دانان هەرچەندە بەڕێزانە و دۆستانەیە بەڵام نە پەیوەندی هەیە راستگۆییەوە و نە بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئەویترە لە ڕێگەی زمان شیرینییەوە:

راهیبێك خەریکی تێڕامان بوو کە لەپڕ سەربازێك هاتە سەر سەری و بەپەلە وتی: ئەی راهیب! خێرا پێم بڵێ کە ئاسکە ئاڵتونییەکە بەرەو کام لا ڕۆیشت؟ راهیب چاوەکانی کردەوە و بە دەست ئاراستەکەی پیشانی سەربازەکەدا. ساتێك دواتر وەزیرێك پەیدا بوو و بە راهیبەکەی وت: تکایە پێم بڵێ دەبێ بۆ دۆزینەوەی ئاسکە ئاڵتونییەکە بەرەو کام لا بڕۆم؟

راهیب دووبارە هەمان ئاقاری پیشانی ئەو دایەوە و هەروا خەریکی تێڕامان بوو. دوایین کەس کە هاتە لای راهیبەکە پاشا بوو. ئەویش روویکردە راهیبەکە و وتی: ئایا دەتووانیت چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت و ئەو ڕێڕەوەم پیشان بدەیت کە بەرەو

ئاسکە ئاڵتونییەکەم دەبات؟ هەڵبەت لەوەی کە سروتەکەتم لێ تێکدایت داوای لێبووردن دەکەم.

راهیب بێ ئەوەی کە چاوەکانی بکاتەوە وتی: بەڵێ ئەی پاشای زەنگین، تکایە ئەم رێگایە بگرە بەر. هێشتا دوور نەکەوتبووەوە، پاشا بە سەرسوڕمانەوە وتی: تۆ بێ ئەوەی کە چاوت بکەیتەوە چۆن زانیت من پاشام؟

راهیب وتی: زۆر ئاسانە. هەر کە کەسێك دەستیکرد بە قسەکردن، دەتوانرێ بزانرێ کێیە. ئاخۆ زاڵبوونخوازێکی لاوازە یان کاریگەرێکی بەهێز.

# ٣-چیرۆکەکانی کاریگەری دانان

## دز و عاریف

دزێك هاتە ناو کۆڵیتێکی پەڕپوتی عاریفێکەوە. ئەم کۆڵیتە لە دەرەوەی شار بوو. عاریف بێدار بوو، جگە لە بەتانییەك هیچی تری نەبوو. شەوانە نیوەی بەتانییەکەی لە ژێر خۆی رادەخست و نیوەی بە خۆیدا ئەدا. لە رۆژیشدا جەستەی رووتی خۆی پێ دادەپۆشی.

عاریفە پیرەکە دزەکەی بینی و چاوەکانی خۆی داخست مەبادا دزەکەی شەرمەزار کردبێت. ئەو دزە رێگایەکی درێژی بڕیبوو بەو هیوایەی کە شتێکی دەست بکەوێت. حەتمەن زۆر هەژار بوو چونکە بۆ دزیکردن هاتبووە ئەم خانووە کەلاوەیەی پیرەمێردەکە. عاریفەکە بەتانییەکەی بەسەری خۆیدا دا و بۆ حاڵی ئەو دزە و نەداریی خۆی گریا. (خودایە هیچ شتێك لە ماڵەکەی مندا نییە و ئەم دزە کەساسە بە دەستی بەتاڵ و نائومێدانە لێرە دەڕوات. ئەگەر ئەم پیاوە بێ نەوایە پێش دوو سێ رۆژ منی لە بڕیارەکەی خۆی ئاگادار بکردایەوە دەچووم پارە قەرز بکەم و بۆم لەسەر رەفەکە دادەنا).

ئەو عاریفە دانایە نیگەران نەبوو لەوەی کە دزەکە شتەکانی دەبات، بەڵکو نیگەرانی ئەوە بوو کە شتێکی بۆ خواردن نییە تا بیبات و دڵی خۆش بکات.

ناو خانووەکەی عاریفەکە تاریك بوو، پیرەمێردەکە مۆمێکی داگیرساند تا دزەکە لە تاریکیدا نەکەوێت و باشتر لەناو ماڵەکەدا بگەڕێت. مامۆستا مۆمەکەی برد تا لەسەر رەفەکەی دابنێت کە لەپڕ رێکەوتی دزەکەی کرد. دزەکە زۆر ترسا.

ئەو دەیزانی کە ئەم پیاوە جێی متمانەی خەڵکی شارە. بۆیە ئەگەر بابەتەکەی لە خەڵك بگەیەندایە ئەوا هەمووان باوەڕیان دەکرد. بەڵام ئەو عاریفە بە دزەکەی وت: مەترسە، هاتووم یارمەتیت بدەم، ناو ماڵەکە تاریکە. من سی ساڵە لەم خانووەدا دەژیم و هێشتا هیچم تیا نەدۆزیووەتەوە. وەرە بگەڕێین ئەگەر شتێکمان دۆزییەوە ئەوا نیوە بە نیوە بەشی دەکەین. هەڵبەت ئەگەر تۆ رازی بیت. ئەگەر ویستیشت دەتووانی هەمووی هەڵبگریت. چونکە من ساڵانێك گەڕاوم و هیچم نەدۆزیووەتەوە، بۆیە هەمووی بۆ تۆ. دواجار دۆزەرەوەکە تۆ بوویت.

دزەکە دڵی نەرم بوو. مامۆستا نە سەرزەنشتی کرد و نە شکاندیشی...

دزەکە وتی: (بمبەخشە مامۆستا. نەمدەزانی ئەمە ماڵی تۆیە، ئەگینا جورئەتم نەدەکرد).

عاریفەکە وتی: (بەڵام باش نییە بە دەستی بەتاڵەوە لێرە برۆیت. من بەتانییەکم هەیە، خەریکە هەوا سارد دەبێت. تکایە ئەم بەتانییە قبوڵ بکە). پاشان بەتانییەکەی دایە دزەکە. دزەکە کە زانی جگە لە بەتانییەکە هیچی تری نییە سەری سوڕما و هەوڵیدا مامۆستا رازی بکات بەوەی کە بەتانییەکە لای خۆی بهێڵێتەوە.

مامۆستا وتی: هەستی من لەوە بریندارتر مەکە. جارێکی تر پێش ئەوەی سەرم لێ بدەیت ئاگادارم بکەرەوە. ئەگەر پێویستیشت بە شتێکی تایبەت هەبوو پێم بڵێوە بۆئەوەی بۆتی ئامادە بکەم. تۆ منت غافڵگیر و شەرمەزار کرد. دەزانم ئەم بەتانییە کۆنە نرخی نییە، بەڵام دڵم تایبەت تۆ بە دەستی بەتاڵەوە رەوانە بکەم. تکایە لێمی قبوڵ بکە، تاهەتایە سوپاسگوزارت ئەبم).

دزەکە گێژ ببوو و نەیدەزانی چی بکات. تاوەکو ئێستا مرۆڤێکی وەهای نەبینیبوو. چەمایەوە و پێیەکانی مامۆستای ماچ کرد. پاشان بەتانییەکەی

پێچایەوە و چووە دەرەوە. ئەو وەزیر و حاکم و فەرمانڕەوای زۆری بینیبوو بەڵام مرۆڤی نەبینیبوو!

پێش ئەوەی دزەکە لەماڵەکە بچێتە دەرەوە، مامۆستا بانگی کرد و وتی: بیرت نەچێت کە ئەمشەو خۆشحاڵت کردم. من هەموو ژیانم لە هەژاریدا بەسەر بردووە، لەبەرئەوەی هیچم نەبوو و لە چێژی بەخشینیش بێبەش بووم، بەڵام تۆ ئەمشەو چێژی بەخشینت پێ بەخشیم و منٚ مەمنونی تۆم).

هەوا سارد ببوو و مامۆستا دەلەرزی، بەڵام دانیشت و هۆنراوەیەك وت:

دڵێکم هەیە خوازیاری بەخشینە بە هەمووان

بەڵام دەستەکانم تا بڵێی بەتاڵن

کەسێك کە هاتبوو سامانەکەم تاڵان بکات

ماڵ بەتاڵ بوو و ئەو بە دڵێکی شکاوەوە گەڕایەوە

ئەی مانگ خۆزگە ئەمشەو هی من بوویت

تاوەکو بمبەخشیتایە بە دزی ماڵەکەم

# كۆیلەی ئازاد

لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا کۆمەڵێك کۆیلەی تازەیان هێنابوون. دەوڵەمەندان و خەڵکی کۆشك بۆ تەماشاکردن و کڕینی کۆیلەی نوێ ڕژابوونە ناو بازاڕەوە. کۆیلەکان لە دۆخێکی قورسدا دەیانگوزەراند. هەموویان سەریان شۆڕ کردبوو و پێیان لە زنجیردا بوو، لەژێر هەتاوی سوتێنەردا چاوەڕێ بوون تا کەسێك بێت و بیانکڕێت.

لەم میانەدا تەنیا یەکێك لە کۆیلەکان شاد و دڵخۆش دیار بوو و وەك بڵێی لە کۆت و زنجیری کۆیلەکاندا نییە!

لەلایەکی ترەوە یەکێك لە شازادەکانی لە کۆشکەوە بۆ کڕینی چەند کۆیلەیەك هاتبووە بازاڕ و سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی کۆیلە نوێکان بوو. بارودۆخی نائاسایی کۆیلەی دڵخۆش سەرنجی ئەوی ڕاکێشا. لێی پرسی:

(بڵێ بزانم، بەم بارودۆخەوە چۆن وەها دڵخۆشیت، وەك بڵێی لەوپەڕی سەربەستی و بێ نیازیدایت؟ ئایا ئەم هەلومەرجە گۆڕانکاری لە حاڵەت و ڕۆحیەتی تۆدا نەهێناوەتە کایەوە؟)

کۆیلەکە لە وەڵامدا وتی: (بۆچی دڵخۆش نەبم، تۆ دەتوانیت کۆت بکەیتە پێیەکانی من، بەڵام هیچ شتێك و هیچ کەسێك ناتوانێت دڵم و ئەقڵم کۆت بکات. ئەوەی کە لە ناوەوەمدا دەگوزەرێت، ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی منە و من لە دەروونمەوە لەوپەڕی دڵخۆشی و ئازادیدام).

کاتێك شازادە قسەی دانایانەی کۆیلەکەی بیست، بۆی دەرکەوت کە ئەو حەکیمێکی ژیرە و کەسێکی ئاسایی نییە. بۆیە ئەوی کڕی و ئازادی کرد و وەکو ڕاوێژکارێك و دۆستێك بردیە کۆشك تا لە باس و خواسی کاروباری وڵاتدا سوود لە ئەزموون و لێهاتووییەکەی وەرگرێت.

بەڵێن مەدە و کە دات لەسەری وەفادار بە

(جامی)

## هێزی کاریگەریی وەفاداربوون بە پەیمان

یەکێك لە نەیارانی (حەجاج بن یوسف سەقەفی)یان هێنایە لای ئەو و ئەویش دەستبەجێ فرمانی کوشتنی دەرکرد.

پیاوەکە وتی: (ئەی ئەمیر، من ئەمانەتی زۆری خەڵکم لایە. مۆڵەتم بدە بڕۆم ئەمانەتەکان بدەمە خاوەنەکانیان و بگەڕێمەوە).

حەجاج وتی: (کەفیل دیاری بکە و بڕۆ).

ئەو پیاوە پاسەوانێکی بۆ دیاریکرا و بەرەو بازاڕ کەوتە ڕێ بۆئەوەی کەفیلێك بدۆزێتەوە. هەڵبەت کەسیش ئازایەتی ئەوەی نەبوو کە ببێتە کەفیلی ئەو پیاوە. لەپڕ چاوی بە پیاوێکی سەرنجڕاکێش کەوت. لێی پرسی: ناوت چییە؟

وتی: عەبدولکەریم.

ئەو پیاوە وتی: (بەندەی کەسی کەریم (بەخشندە)ش خاوەن کەرەمە. دۆسیەکەی من وەهایە و وەرە ببە بە کەفیلم تا ئەمانەتەکان بدەمەوە و بگەڕێمەوە).

ئەو کەسە وتی: (من بۆ پاراستنی گیانم، ناوی خۆم بەهەدەر نادەم) و کەفالەتەکەی قبوڵ کرد.

ئەو پیاوە ڕۆیشت و ئەمانەتەکانی گەڕاندەوە و کاتێك گەڕایەوە بۆی دەرکەوت کە کەفیلەکەیان بۆ کوشتن ئامادە کردووە. هاواری کرد:

—ئەمیر! ئێستا هاتووم، کەفیلەکە ئازاد بکەن.

جەلادەکە پێی سەیر بوو. وتی: (چۆنە بۆ کوژران گەڕاویتەتەوە؟)

وتی: (فەرمانی حەقی خوداوەندی من بگەڕێننەوە. لەوێدا کە دەفەرموێت:

(وەفادار بن بە پەیمانەکەم تا وەفاداریم بە پەیمانەکەتان)

وەفداربوون بەرانبەر پەیمان لە ئیمانەوەیە. من لە ئیمان ناچمە دەر کە گیانی خۆم بپارێزم.

حەجاج کە گوێی لەم قسانە بوو هەردووکیانی ئازاد کرد.

# هێزی کاریگەریی بەخشین

دەڵێن مافرێك لە لە گەرمەی ململانێدا بە عەلی (د.خ) وت: شمشێرەکەم بدەیە.

شمشێرەکەی دایە.

وتی: یا عەلی، یان جوامێرێکی سەرسەختی، یان مەزنێکی نەزان و بێ ئەزموونیت، بۆچی شمشێرت دایە دوژمن؟

عەلی وتی: تۆ دەستی دەرۆزەکەرانەت بەرەو من درێژ کرد، رووم نەهات پیسکەیی زەفەرم پێ ببات. هەرچەندە دڵی دوژمنت هەبوو، بەڵام زمانت هی دەرۆزەکەر بوو. دەڵێن ئەو کافرە بوو بە موسڵمان.

**روح الارواح**

**شەهابەدین ئەحمەد سەمعانی**

# به خاكیبوون دەتووانیت كاریگەر بیت

دەڵێن لە یەكەم جەنگی جیهانی و پێكهێنانی حكومەتی كاتیدا لە خۆرئاوای ئێراندا كە دواجار بووە هۆی كۆچكردنی هەندێ ئەندامی كابینەی حكومەتی كاتی بەرەو ئەستەنبوڵ، لەكاتی ڕۆیشتن بەرەو توركیا، جێگەی پێویستیان لە شەمەنەفەردا نەبوو. دەوڵەتی عوسمانی بۆ رەچاوكردنی حاڵی كۆچبەران و ڕێزگرتن لە جەنابی (مودەریس) ، فەرمانیدا ئۆتۆمبێلێكی تایبەت بۆ كۆچبەران بە شەمەنەفەرەوە ببەستنەوە و چەند كارمەندێكی تایبەت پارێزگاری لەم گروپە بكەن.

لە ناوەندی ڕێگادا ویستیان لە شوێنێك پشوو بدەن. مودەریس هەڵسا و قۆرییەكی پاكی لەسەر ئاگر دانا و چایەكی بۆنخۆشی لێنا. پاشان هەڵسا و چەند چایەكی برد بۆ پاسەوانەكان.

سەرۆكی پاسەوانەكان بیری لەشێوازی خزمەتگوزاریی بە ڕواڵەت سادەی مودەریس كردەوە و وایزانی چایچی ئەو گروپەیە. بە ئاماژە فەرمانی پێدا كە چایەكی تر بێنێت. مودەریس بەوپەڕی ڕووخۆشییەوە چای دووەمی هێنا. كاتێك لە شار نزیك كەوتنەوە؛ سەرۆكی پاسەوانەكان هات و بە وەرگێڕەكەی وت كە دەیەوێ پارەی چا بدات. وەرگێڕەكە وتی: پارە پێویست ناكات. بەڵام ئەو ئەفسەرە سوور بوو لەسەر ئەوەی كە دەیەوێ پیرەمێردە چایچییەكە زیانمەند نەبێت.

لەهەمان كاتدا شەمەنەفەرەكە وەستا. كۆمەڵێك كەس پێشوازییان لە گروپەكە كرد و بە سڵاو و ڕێزێكی زۆرەوە پێشوازییان لە (مودەریس) كرد. وەرگێڕ بە

پاسەوانەکانی وت: ئەم ئۆتۆمبێلە تایبەتە هەر بۆ ئەم پیاوە بەرێزە بە شەمەنەفەرەکەوە بەستراوە.

سەرۆکی پاسەوانەکان کە لە بەسەرهاتە شەرمەزار ببوو و لەهەمان کاتدا بەلایەوە سەیر بوو، روویکردە دۆستان و وتی: سوێند بە خوا کە ئێمە کەسێکی بەو مەزنییەمان نەبینیووە.

حەز دەکەم ئەم رەفتارە بەهێزە لەگەڵ نموونەیەکی مێژوویی تردا دابنێم کە بارەی مەشرەب و کردارەوەیە:

زۆرجار پاشاکانی ئێران بەلایانەوە نەنگی بوو کە لەگەڵ خەڵکی ئاسایی چینی ناوەند تێکەڵ بن. ئاغا محەمەدخانی قاجار کە پیاوێکی ستەمگەر و ستەمکارێکی بێباك بوو پاش گەیشتنی بە پاشایەك خۆی لە خەڵکی ئاسایی جیا دەکردەوە و بە عەیبە لەقەڵەمی ئەدا.

(سێر جان مالکۆم) لە مێژووی خۆیدا لەمبارەیەوە بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە: (حاجی برایم خان بۆ "سێرجان مالکۆم)ی گێڕابووەوە کە کاتێك دوو کەس لە چینی ناوەند کە دەوڵەمەند بوون ویستیان زنجیرە خانوویەك بەکرێ بگرن. ئەگەرچی هەندێ کەسی چینەکانی سەرەوەش مەبەستیان بوو هەر ئەو زنجیرە خانووە بەکرێ بگرن، بەلام ئەم دوو کەسە پارەیەکی زیاتریان دەدا.

من لەبەرئەوەی دەمزانی ئاغامحەمەد خان بەهۆی چاوچنۆکییەکەیەوە بۆ پارە بەم مامەڵەیە زۆر دڵخۆش دەبێت، پێم وتن بۆ گەیشتن بە خواستی خۆتان دەبێ بێنە لای پاشا.

ئەوانیش قبوڵیان کرد و من سەرەتا بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی هاتنیان چوومە لای ئاغامحەمەد خانی قاجار. شا لێی پرسی: ئەمانە کێن؟

من ناو و پیشەی ئەوانم وت و خواستەکانیانم باس کرد و ئەو بڕە پارەیەشم بە پاشا وت کە ئامادە بوون بیدەن. ئاغامحەمەد خان وتی: من ئەم جۆرە خەڵکانە نابینم.

من وتم: بەڵام ئەو بڕە پارەیەی کە دەیدەن زۆرە؟

شا وتی: (گرنگ نییە، دەبێ شتی تری بەدەر لەم پارەیە بڵێیت. ئەم جۆرە خەڵکانە نابێت بێنە لای من).

# فەرماندەی کاریگەر

گروپێك لە سەربازان بە فەرماندەیی ئامر سریەیەك خەریکی دروستکردنی دیوارێکی بەرگری بوون. خەریکی کێشانەوەی کۆڵەکەی داری قورس بوون بەرەو دیوارەکە. ئامرسریەکە لەلایەکەوە وەستابوو و بە دەنگی بەرز فەرمانیدا.

(پاڵی پێوە نێن! هەموو پێکەوە بەرزی بکەنەوە!)

سەربازەکان هێز و وزەی خۆیان کۆ دەکردەوە و هەوڵیان دەدا کۆڵەکە قورسەکە بخەنە سەر کۆڵەکەکانی تر. دارەکە قورس بوو و کاتێك دەخرایە سەر دارەکانی تر، ئەخزا و بەرەو خوارەوە گلۆر دەبووەوە.

ئامر سریەکە جارێکی تر هاواری کرد:

(توندتر پاڵ بنێن! هەموو پێکەوە، یەك،دوو،سێ، دەی ئێستا!)

جاری سێیەم، رێك لەو ساتەدا کە کۆڵەکە دارەکە لەسەر ئەوانەیتر بوو و بەرەو خوارەوە گلۆر دەبووەوە، کەسێك کە تا ئەو کاتە چاودێری ئەم چالاکیانە بوو، بەرەو پێشەوە رایکرد و بەهەموو هێزی خۆی بەرزی کردەوە و سەرەنجام دارەکە لە شوێنی خۆی جێگیر بوو.

سەربازەکان بە هەناسەبڕکێ و عەرەقی زۆرەوە سوپاسیان کرد، بەڵام ئەو کەسە روویکردە ئامرسریەکە و لێی پرسی:

(بۆچی خۆت یارمەتییان نادەیت؟)

ئامر سریەکە وتی: (بۆچی دەبێ یارمەتییان بدەم؟ ئەی نابینیت من ئامر سریەم؟)

جۆرج واشنتن لەکاتێکدا کە پالتۆ گەورەکەی خۆی لە لاوە دانا تا جلە یەکپۆشییەکەی خۆی پیشان بدات، وتی:

(من تاکە فەرماندەی ئێرەم، جارێکی تر کە ناچار بوویت کۆڵەکەیەکی قورس بەرز بکەیتەوە ئاگادارم بکەرەوە!)

# رابەرە ئیلهامبەخشەکان

کەسێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا کە خاوەنی زانست و پسپۆڕی بوون، بۆ ئەرك دەچوونە خاڵە جیاجیاکانی سەنگەر. فەرماندەکەیان شەهید جەلیل ساداتی بوو. ئەم کەسە هەرچەندە زانستێکی زۆری هەبوو، بەڵام تەنبەڵ بوو و لەکاتێکدا کە و کار بەش دەکرا لەژێر ئۆباڵی هەموو کارە خزمەتگوزارییەکاندا بۆی دەردەچوو.

تا ئەوەی کە جارێکیان هاوڕێکانی بڕێکی زۆر جل دەخەنە ناو تەشتێك و ئاو و تایتیش دەکەنە ناو ئاوەکە و پێی دەڵێن، تا دەگەڕێینەوە دەبێ ئەمانە شتبێتن. کاتێك هاوڕێکانی لەوێ دەچنە دەر، ئەویش لە گۆشەیەك ئەخەوێت تا ئەوەی کە فەرماندە ساداتی هاوار دەکات و دەڵێت پێویستم بە تەشتە بۆم بێنن. ئەو هیچ گرنگی پێ نادات. فەرماندە دەچێتە ناو چادرەکە و قسەکەی دووبارە دەکاتەوە. ئەو خۆی لەخەو ئەکات تا ئەوەی کە بە راستی خەوی پیا دەکەوێت.

پاش چەند سەعاتێك کە هاوڕێکانی دێن و لە خەو هەڵیدەستێنن و بە گەرمی سوپاسی دەکەن. ئەو لەبارەی بابەتەکەوە پرسیار دەکات و ئەوان لە وەڵامدا لەبەر شتنی جلەکان سوپاسی دەکەن و تەنانەت لەبەر رێکخستن و گسکدانی چادرەکەش ستایشی دەکەن.

ئەو تازە بە بابەتەکە دەزانێت و دەچێتە شوێن فەرماندە. جەلیل ساداتی تاوەکو چاوی پێی بکەوێت، دەڵێت، بۆت نییە تا ئەو کاتەی من زیندووم لەمبارەیەوە لە بارەی ئەم بابەتەوە قسە لای هیچ کەسێك بکەیت. لەو بەرەوارە بەدواوە، ئەم کەسە نەك تەنیا لە کارە خزمەتگوزارییەکان خۆی نەدەدزییەوە، بەڵکو تەنانەت کاری پێشوازیشی ئەنجام دەدا.

# سەربازی نیشتمان

لە ساڵی ١٩٤٠دا هێزەکانی ئەڵمانیای نازی وڵاتی دانیمارکیان داگیر کرد. بە فەرمانی سەرانی نازی، ئاڵای ئەڵمانیا لەسەر کۆشکی پاشایەتی شەکێنرایەوە. پاشای دانیمارك رەخنەی لەم کردارەی ئەوان گرت و بە فەرماندەی ئەڵمانی وت:

ئەگەر تاوەکو پێش نیوەڕۆ ئەو ئاڵایە نەهێنیتە خوارەوە، ئەوا سەربازێکی دانیمارکی دەیهێنێتە خوارەوە.

فەرماندەی ئەڵمانی وتی: لەو بارەجا ئێمەش ئەو بە فیشەکێك سارد دەکەینەوە.

پاشا وتی: بەڵام ئەو سەربازە خودی خۆم دەبم.

چەند خولەکێك دواتر، ئەڵمانییەکان ئاڵای خۆیان هێنایە خوارەوە.

تۆ دەتووانیت بە راگەیاندنی ئامادەبیت بۆ گیانبەخشین لەپێناو ئامانج و بیروباوەڕتدا بەرزترین پلەی کاریگەری دانان بخەیتە ڕوو.

# هاتووینەتە دنیاوە تا بیگۆڕین
# (ژیاننامە ئیلهامبەخشەکان)

هەمووان لە کەناری دەریاکەدا خەریکی سەرگەرمی و شادی بوون. هەندێکیان خەریکی مەلە و هەندێك خەریکی خۆهەڵخستن لەبەر هەتاو بوون. بەڵام هیچ کەسێك سەرنجی نەدەدایە پیرەژنێکی چەماوە و سادە کە زەرفێکی پلاستیکی گەورەی لە دەستدابوو و سەرقاڵی کۆکردنەوە شت بوو لەسەر زەوی.

(برایان) بەلایەوە سەیر بوو. ئەو هەمیشە ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بوو کە دەکرێ لە هەموو چالاکییەك پارە کۆ بکەیتەوە و بە ئاسانی ناتووانیت خۆت لە دەرفەتە گونجاوەکان قوتار بکەیت. ئەو وتاربێژێکی هاندان بوو کە ساڵانێکی زۆر لەبارەی سەرکەوتن و شێوازەکانی گەیشتن بە پارە وانەی دەوتەوە. چەند کتێبێکی پڕفرۆشیشی لەم بوارەدا نوسیبوو.

پێی وابوو ئەم پیرەژنە حەتمەن خەریکە ئەو شتانە هەڵدەگرێتەوە کە بە فرۆشتنیان ژیانێك بۆ خۆی دابین دەکات. بۆیە لێی نزیك کەوتەوە. کەوتبووە جۆش لەوەی کە حەتمەن رێکەوتی نموونەیەکی کردووە و باسکردنی لە سێمینارەکانیدا گەواهییەکی باش دەبێت بۆ وتە هەمیشەییەکانی کە (هەموو مرۆڤەکان دەتووانن لە هەموو رێگایەکەوە بگەنە پارە).

بەڵام کاتێك گەیشتە نزیك پیرەژنەکە بۆی دەرکەوت کە خەریکی کۆ کردنەوە وردە شوشەی سەر لمەکانە.

بەسوودوەرگرتن لە بنچینەکانی دروستکردنی پەیوەندی کە تەمەنێك بوو لەبارەیەوە وانەی دەوتەوە، چووە ناو مشتومڕەوە لەگەڵیدا، لەکاتێکدا کە

دەیویست بزانێ ئەم وردە شوشانە چ نرخێکیان هەیە کە پیرەژن بەردەوامە لە کۆکردنەوەیان.

بەڵام پیرەژن قسەکانی بەلایەکی پێچەوانەی چاوەڕوانی ئەودا برد: ئەو چیرۆکی ژیانی باس کرد و ئەوەش کە تاکە منالّی دلگیری، پێش سالانێك هەر لەم کەناراوەدا کە خەریکی یاریکردن بوو لە رووداوێکدا لە دەستدابوو. پارچەیەك لە شوشە بەناو پێیدا چووبوو و برین و ئاوسانەکەی ببووە هۆی ئەوەی دوای چەند رۆژێك گیان لەدەست بدات. ئەو لە سەرەتادا دووچاری خەمۆکێ ببوو، بەلام بە خۆکۆکردنەوە و خۆڕێکخستنەوەی، بەمشێوەیە کەوتە بەڕێوەبردنی قەیرانەکەی ژیانی، بەوەی کە هەموو رۆژێك چەند سەعاتێك لە کەناری دەریا پیاسە بکات و وردە شوشەکان لەوێ کۆ بکاتەوە بۆئەوەی ئەوەی کە بەسەر منالّەکەی ئەم داهات بەسەر منالّی ئەوانیتردا نەیەت.

ژیان هەمیشە پڕە لە رووداوی بچوك و گەورەی وەها کە ئارامی، ئاسایش و جێگیریمان تووشی گرفت دەکەن. چۆنێتی تێڕوانین و رووبەڕووبوونەوە لەگەلّ دژوارییەکان و هەلومەرجی سەختی ژیان دیاریکەری چۆنایەتی ژیانە.

لە کتێبی (کێشەکان بکەنە شوکولاتە)دا هەولّم داوە بە دەربڕینی نموونە جیاجیاکان لەبارەی ئەو کەسە پایەدارانەی کە بە ئیرادەیەکی تۆکمەوە رووبەڕووی تەنگانەکانی ژیان بوونەتەوە، پیشانی بدەم مرۆڤ بوونەوەرێکی دەست و پێ بەستراو نییە لەبەرانبەر رووداوەکانی ژیانیدا و نەك تەنیا دەتوانێت لە بەرانبەر هەڕەشە و قەیرانەکاندا بەرەنگاری بکات، بەلّکو توانای ئەوەشی هەیە کە هەڕەشەکان بکاتە دەرفەتی بێگەرد بۆ گەشە و پشکوتنی بواری ناوەوەی بگۆڕێت. ئەمە تێڕوانینێکە کە تاکەکەسە کاریگەرەکان هەیانە. ئەوان مامۆستایانی بێ جێگرەوەی گۆڕینی کێشەکانن بۆ بەرەنگاری.

بـەرەنگاری تـەنیا سـنووردار نـابێ بـە قەڵـەمڕەوی ژیـان و بەرژەوەندییـە تایبەتییەکان بـەڵکو زیـاتر رابـەرانی رەسـەن ئامـانجی بـاڵا و ناشەخسـییان هەیـە بەجۆرێك کە کۆبەندی هەوڵ و دەستکەوتەکانی ژیانیان مژدەبەخشـی گۆڕانکارییـە پۆزەتیڤەکانە لە ژیانی کەسانێکی زۆردا.

(هاتووینەتە دنیا تا بیگۆڕین) پەیام و دروشمی تاکـە کاریگەرەکانـە. کەسـانێك کە لـەبری گرتنەبـەری تێڕوانینی مرۆڤـی قوربـانی، هەلومـەرجی سـەخت دەکەنـە قوربانیی ئیرادەی خۆیان.

بەشی کۆتایی ئەم کتێبە گێڕانەوەی چەند سەربوردەیەکی ئەو جۆرە کەسانە.

بالندە بە بالّ دەفرێت بۆ هێلانە
بالّی خــەلك هیمەتە ئەوە بزانە
(مەولانا)

## ژیاننامەی ئیلهامبەخش(۱)

ژنێك كە لە دوو دەست بێبەش بوو بەلاّم سێ بڕوانامەی دكتۆرای هێنا

مارگرێت شانین كچێكی جوان بوو كە لـە زانكـۆی تەكسـاس سـەرقالّی خوێنـدن بوو لە بواری ددانسازیدا. رۆژێكیـان مارگرێـت و دەزگیرانەكـەی لـە نزیـك كەنـداوی مەكسیك لە بەلەمێكی ماتۆڕدا سەرقالّی گەشت بوون. لە كۆتایی ڕۆژەكـەدا ئـەوان بڕیاریاندا بەرەو كەناری دەریا بگەڕێنەوە.

مارگرێت بـە هـەردوو دەسـتی، زنجیرێكـی گرتبـوو كـە بەلەمەكـە بەهۆیـەوە بـە لەنگەر دەبەسترایەوە. لـەپڕ بەلەمەكـە تـەكانێكی تونـدی كـرد و لەگـەلّ م جولّـە لـەناكاوەدا، مارگرێـت بـە سـەختی كەوتـە لاوە. دەزگیرانەكـەی كـە لەلایـەوە وەستابوو، ئەوی راكێشایە لاوە، بەلاّم بەهۆی ناوریایی و توندیی زۆر، دەستی بـەر كۆمەلّە وایەرێكی بەلەمەكە كەوت و وایـەری كارەبـا لـە شـوێنی خـۆی هەلّكەنـدرا. شـەپۆلە كارەباییـەكانی وایـەرەكان، بــە لایــەكانی بەلەمەكـەدا و پاشـان بــە دەستەكانی مارگرێتدا تێپەڕین و پاشان گەیشتنە دەزگیرانەكەی و ئـەویان كوشـت و بوونەهۆی بڕینەوەی دەستەكانی مارگرێت لە شانەكانییەوە.

كاتێك مارگرێت لە نەخۆشخانە دەگەڕایەوە دوو دەسـتی خـۆی لەدەسـتدا بـوو، بیركردنەوەیـەكی هەراسـانكەر ئـازاری دەدا، لـە پـێش هەمووشـیان: ئەمـەی كـە ئایندەدا، ڕۆژگار چۆن چۆنی لەگەلّ ژنێكی بێ دەستدا رەفتار دەكات؟

کاتێك قەیرانە گەورەکان، بۆ گۆڕان و تەحەدیی سەختی ژیانمان راماندەکێشن و کاردانەوەی ئێمە بۆ ئەم هەلومەرجە سەختە، دیاریکەری ئەو مەسەلەیە دەبێت کە ئێمە لە ریزبەندی کەسانی کارادا دەبین یان کەسانی کارتێکراو.

تۆ ئەگەر لە شوێنی ئەم خوێندکارە گەنج و پڕ ئاواتە بوویتایە و لە یەك کاتدا هەرچییەك کە هەتبووایە لەدەستت بدایە، چیت ئەکرد؟

مارگرێت بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ زانکۆی بەتەواوی بەلاوە نابوو تا ئەوەی کە رۆژێك لە رۆژان (دکتۆر ئەلیوت)ی بینی، کە بەڕێوەبەری ئەو کۆلێژە بوو کە ئەو تیایدا دەیخوێند. دکتۆر ئەلیوت کاتێك پەی بە بارودۆخی مارگرێت برد، وتی زۆربەی دکتۆرەکانی ددانمان دەستیان هەیە بەلام شتێك کە زیاتر لە هەموو شتێکی تر پێویستیان پێیەتی هەبوونی هێزی بیرکردنەوە و یاری نەکردنە بە گیانی خەڵك.

ئەم قسانە لەپڕ بیرۆکەی وازهێنان لە کۆلێژیان لە مارگرێتدا گۆڕی بۆ عەشق بۆ خوێندن و درێژەدان بەو بوارەی کە گرتبوویە بەر و ئەو لەکاتێکدا کە دوو دەستی لە قوتابییەکانی تر کەمتر بوو، جارێکی تر چووەوە بۆ زانکۆ. بەلام بەداخەوە، لەوێ رووبەڕووی کێشەیەکی گەورە بووەوە. وانە کردارییەکان و نووسینەوە بەشێکی زۆری خوێندنەکەیان پێکدەهێنا. بەلام ئەو ژنە ئازایە پێکەنینی بەو بەربەستانە هات کە لەبەردەمیدا بوون، چونکە لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا لەبری وەلامدانەوەی پرسیارەکان بە نووسین، بە کەسێکی تری دەوت بۆ بنووسێتەوە یان بەشێوەی زارەکی وەلامەکانی دەوت و لەکاتی وانە کردارییەکاندا تەنیا ئەوەندەی بەس بوو کە بڕوانێتە کاری قوتابییەکانی تر.

ساڵێك بەسەر رووداوی بەلەمەکەدا تێدەپەڕی کە مارگرێت بۆ بەدەستهێنانی دەستی دەستکرد چووە شاری میناپۆلیس، بەلام لەوێ بۆی دەرکەوت کە

ناتوانێت لە دەستێکی دەستکرد زیاتری هەبێت، چونکە لە دەستی راستی تەنیت هەشت سانتیمەتر و لەدەستی چەپ چوار سانتیمەتر زیاتری نەمابووەوە و زانستی پزیشکی لەو وەختەدا ئەوەندە بەرەوپێش نەچووبوو کە بتوانێت دەستێکی دەستکرد بەو لایەوە بلکێنێت کە تەنیا چوار سانتیمەتر درێژ بوو. بەڵام ئیرادە و مکوڕیی مارگرێت لەوە بەرزتر بوو کە لەبەرانبەر ئەم کێشە بچوکانەدا مل بدات.

ساڵی ١٩٤٣ هات و مارگرێت یەکەمین هەنگاوی لە رێگای سەرکەوتندا هەڵێنا. ئەو بۆ جیهانی سەلماند کە کەموکوڕیی جەستەیی لەبەرانبەر ئیرادەی ئاسنین و بەهێزدا هیچ نییە. ئەو لەم ساڵەدا بڕوانەی دکتۆرای ددانسازی لە زانکۆی تەکساس بە پلەی زۆر باشە بەدەست هێنا.

پاشان بۆئەوەی بە کردار پیشانی بدات کە ئاستی کاریگەری و مەزنایەتیی رۆحی مرۆیی تا چ رادەیەك فراوانە، لە زانکۆی میشیگان ناوی خۆی تۆمار کرد بۆ خوێندن لە بوارەکانی ئەزموونی و تەندروستی گشتیدا و دەستی بە چالاکی کرد.

دوو ساڵ دواتر، کاتێك مارگرێت لە زانکۆی میشیگان خەریکی خوێندن بوو بە مارتین شانین ئاشنا بوو. مارتین لەم زانکۆیەدا لە بواری کیمیادا دەیخوێند.

ئەو گرنگییەکی تایبەتی ئەم ژنە کەم ئەندامە دەدا.

مارگرێت وێڕای ئەوەی کە خۆشەویستییەکی زۆر لە دڵیدا هەبوو بەرانبەری، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە ئاخۆ بەبێ دەست دەتوانێت پیاوێکی تەندروست بەختەوەر بکات و ئایا هاوسەرگیری بۆ ژنێکی وەها گونجاوە؟

بەڵام مارتین کە ئاشنای رۆحی گەورە و ئیرادەی بەهێزی ئەو ببوو، کەم ئەندامییەکەی ئەوی بەهیچ شێوەیەك بەلاوە گرنگ نەبوو، جوانی و باشییەکانی مارگرێت ئەو کەم ئەندامییەی شاردبووەوە و مارتینی بە تەواوی گیرۆدەی عەشقی کردبوو.

دواجار لە یەکێك لە ڕۆژە ئاساییەکانی ساڵدا، ڕێك ڕۆژێك دوای ئەوەی کە مارگرێت پلەی دکتۆرای لە پزیشکی گشتی و دکتۆرای تەندروستی (سێیەمین بڕوانامەی دکتۆرا) بەدەستهێنا، مەراسیمی هاوسەرگیریی ئەو و مارتین لە شاری (ئان ئاربور) بەڕێوەچوو لەکاتێکدا کە مارگرێت سێ پلەی دکتۆرای لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی هاوسەرەکەی دەبرد.

دوو هاوسەرە گەنجەکە ساڵێك لە ئان ئاربور مانەوە و لەو ماوەیەدا، لەکاتێکدا کە مارتین ببووە ئەندازیار و خەریکی وانە وتنەوە بوو، هاوسەرەکەی خەریکی نووسینی تێزی پۆست دکتۆراکەی خۆی بوو.

پاشان ئەوان چوونە ئەیالەتی ئیندیانا لەوێ شەش ساڵ مانەوە و بەدرێژایی ئەو ماوەیە دوو مناڵیان هەبوو و لە ئەیلولی ١٩٥٣دا چوونە کالیفۆرنیا. لەوێ مارگرێت بووە خاوەنی دەستی دەستکردی تازە کە بەهۆیەوە دەیتووانی زۆربەی کارەکانی ماڵ لەوانەش چێشتلێنان، شتن و ئوتوی جل ئەنجام بدات و سەرباری ئەمەش لە نەخۆشخانەی شار سەرقاڵی کار بوو.

لەو ڕۆژانەدا کە مارگرێت لە بەختەوەریدا نغرۆ ببوو (بەختەوەری دروست دەکرێت نادۆزرێتەوە) ئەو ساتانەی بیر دەهاتەوە کە نائومێدی، نیگەرانی و نائاسودەیی تا ئەوپەڕی قوڵاییەکانی تەشەنەی کردبوو و تەنانەت ئەو کاتانەشی دەهاتەوە یاد کە لەبەر خۆیەوە ئەیوت بۆ چی دەژیت؟

لەو وەختانەدا، دایکی لە وەڵامدا دەیگوت: (کاتێك دێت کە پەی دەبەیت بەوەی ئامانجی گەورە لە ژیانی تۆ و نموونەی وەکو تۆدا هەیە و دیاری دەکەیت کە ئەرکێکی مەترسیدار لە جیهاندا بە تۆ سپێردراوە).

ئـەركی مەترسـیداری مـارگرێتیش ئـەوە بـوو كـە بـە ئـیرادە و هێزێكـی رۆحییەكەیەوە بووە مۆدێلێك بۆ هەموو مرۆڤەكان بۆ سەلماندنی ئـەو قسـەیە كـە ئاستی ئێمە وەكو مرۆڤێك بەرزترە لە ملدان و كەوتنەژێر كاریگەریی هەلومەرج.

مرۆڤ بوونەوەرێكی بێچارە و داماو نییـە بـەڵكو خـاوەنی هێـزی ئـیرادە و هێـزی دەروونییە كە زۆر گەورەترە لە هەموو قەیران و هەلومەرجێك كە لەبەردەمیدایە.

بیرتان بێت ئێمە لەوە گەورەترین كە بیری لێ دەكەینەوە.

دەسـتی خۆتـان بخەنـە سـەر دڵتـان و بـە شـانازی و لوتبەرزییـەوە بڵـێن: مـن فەرمانڕەوای بێ چەندوچونی ژیانی خۆمم. من گـەورەترین هۆكـاری ژیـانی خـۆمم، من یەك مرۆڤم، مرۆڤێكی كارا.

# ژیاننامەی ئیلهامبەخش (٢)
# دوو وانە لە ژیانی مارگریت شانین

١-توێژینەوەی سەربوردەی ئیلهامبەخشی مارگرێت شانین ئێمە بەرەو چاوخشاندنەوە بە چەمکی (کەم ئەندامی) ئاراستە دەکات. بە بیستنی ئەو رستەیەی کە (فڵان کەس کەم ئەندامە) کێت بیر دەکەوێتەوە؟ کەسێک کە لەسەر کورسی کەم ئەندامان دانیشتووە، دار شەقەی لەژێر باڵیدایە و یان بە گۆچانی کوێران خەریکی پەڕینەوە لە شەقامە و هیتر...

لە راستیدا (کەم ئەندامی) چەمکێکی مەعریفەیی و ئەقڵییە. مرۆڤی کەم ئەندام کەسێک نییە کە ئەندامێکی نەبێت. کەم ئەندام کەسێکە کە خۆی وەکو قوربانی هەلومەرجی ژیان دەبینێت.

کەم ئەندام کەسێکە کە کەموکورتی فیکری هەیە. کەسێکە کە خاوەنی بیروباوەڕ و بیرکردنەوەی سنووردار و دەست و پێ گیرە.

کەم ئەندام کەسێک نییە کە نابینێت، بەڵکو کەسێکە کە چاوەکانی بەستووەتەوە بە دەرفەت و نیعمەتە گەورەکانی ژیان.

کەم ئەندام کەسێک نییە کە نابیستێت، بەڵکو کەسێکە کە مۆسیقای جوانی ژیان دەبیستێت، ئاوازی خرۆشێنەری فریشتەکان و دەنگی گوتاری عەشق لەم گومەزە سوڕاوەدا نابیستێت.

کەم ئەندام کەسێک نییە کە ناتوانێت بە رێگەدا بڕوات، چ جای ئەو مرۆڤە بە رواڵەت کەم ئەندامانەی کە پێیان نییە، بەڵام بە درک و زانینی رەسەن و راستەقینەی خۆیان حەوت شاریان لە رووناکیدا بینیووە.

مرۆڤی کەم ئەندام کەسێك نییە کە دەستی نییە، بەڵکو کەسێکی هەڵچوو و دەست و پێ سپییە کە هێزی ئەفرێنەرایەتی و گەشبینیە بۆ بنبەست شکاندن و چارەسەری ئەفرێنەرانەی مەتەڵی ژیان.

دواجار کەم ئەندام کەسێك نییە بتوانێت قسە بکات، کەم ئەندام کەسێکی لاساییکەرەوە و بێ بڕوایە بە خۆی کە هێزی سەربەخۆیی بڕیاردانی نییە. ئەو هێز و دەسەڵاتی دەداتە دەست ئەوانیتر تاوەکو لەبری ئەو بیر بکەنەوە و بڕیاری بۆ بدەن. بەمشێوەیەش مۆڵەتی وەبەرهێنان و داگیرکردنی خۆی داوەتە دەست مرۆڤە هەلپەرستەکان.

٢-ژیانی مارگرێت شانێن پێناسەیەکی دووبارەی چەمکی (سەرنجڕاکێشییە). جوانی و سەرنجڕاکێشی شتێکە کە هەموومان دەمانەوێ. بەڵام ئەزموونی مارگرێت بە رەهەندێکی تری مانای سەرنجڕاکێشی ئاشنای کردین. سەرنجڕاکێشیی ئەودیو سەرنجڕاکێشی جەستەیی. سەرنجڕاکێشییەك کە سەرچاوەگرتووی مەزنایەتی ئیرادە و رۆحیەتی مرۆیی بێ وچانی ئێمە.

لەم دنیایەدا هیچ شتێك بە ئەندازەی مەزنایەتی، جوانی و سەرنجڕاکێشی نییە. لە راستیدا ئەو کاتەی کە ئێمە لە تەنگانە و قەیرانەکانی ژیاندا مل نادەین و بە دان بەخۆداگرتنێکی جوان و ململانێیەکی سەرسەخت کە بەرانبەر هەلومەرجی سەخت لە خۆمانی دەردەخەین، مەزنایەتی رۆح و دەروونی مرۆییمان ئاشکرا دەکەین. ئەو مەزنایەتی و بوونەی کە ئەوانیتر دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە، لە راستیدا دڵەکانی ئەوان رکێف دەکات و دەبێتە هۆی بەکێشبوونیان.

# ژیاننامەی ئیلهامبەخش (٣)
# سەربوردەی سەرسوڕهێنی محەمەد یونس

تاووتوێکردنی سەربوردەی کەسە کاریگەرەکان پیشاندەری ئەو راستییەیە کە ئەوانیش وەکو زۆرێك لە کەسان ژیانێکی ئاساییان هەبووە. بەلاّم رووداوێك یان کەوتنە ناو هەلومەرجێکی تایبەت هاوشانی بینایی و هێزێکی هەڵسەنگاندنی دروست، ژیانی ئەوانی بۆ هەمیشە گۆڕیووە و بە دانی بڕیاری بچوك و هەندێ جاریش گەورە بوونەتە سەرچاوەی گۆڕانکاریی مەزن.

ژیانی محەمەد یونس بەنگلادشی (١٩٤٠) جەختکەرەوەی ئەم قسەیەی منە. ئەو ئەفرێنەر و داهێنەری قەرزی بەشەکییە (مایکرۆ کرێدیت)ە کە جۆرێکە لە قەرزی بچوك بۆ بێکاران و کرێکارانی هەژار. هەروەها ئەو دامەزرێنەری بانکێکە بەناوی (گرامین بانك).

محەمەد یونس دکتۆرای خۆی لە ئابووریدا لە زانکۆی فاندرلویتی ئەمریکا بەدەستهێنا و لە ساڵی ٢٠٠٦دا تووانی خەلاّتی نۆبڵی ئاشتی بەدەست بێنێت.

بەلاّم چیرۆکی سەرسوڕهێنی محەمەد یونس لە زمانی خۆیەوە بخوێننەوە:

(بابەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێش چەند دەیەیەك. سەروەختێك کە من لە یەکێك لە زانکۆکانی بەنگلادشدا وانەی ئابووریم دەوتەوە، ولاّت دووچاری قڕوقاتی و نەبوونی ببووەوە. هەستێکی زۆر ناخۆشم هەبوو. من لە ناو پۆلدا تیۆرە تەڕوبڕ و رەنگاوڕەنگەکانی ئابووریم دەوتەوە. تازە بڕوانامەی دکتۆرای خۆم لە ولاّتی ئەمریکا بەدەستهێنابوو. بەلاّم کاتێك کە لە پۆل دەچوومە دەر، چاوم بەو جەستە لەڕ و لاوازانە دەکەوت کە چاوەڕوانی مەرگیان دەکرد.

هەستم دەکرد ئەوەی فێری بووم و ئەوەی لە ناو پۆلدا دەیلێمەوە واقیعی نین و بۆ ژیانی خەڵك مانایان نییە. لەم رووەوە ویستم بزانم ئاخۆ خەڵکی گوندەکەی نزیك زانکۆ چۆن چۆنی دەژین. دەمویست بزانم ئاخۆ وەکو مرۆڤێك کارێك هەیە بیکەم تا بتوانم مەرگ لەم رووت و رەجاڵانە دوور بخەمەوە، ئایا دەتوانم تەنانەت ئەگەر بکرێ یارمەتی کەسێکیشیان بدەم.

ئەمدەویست وەکو باڵندەیەکی بەرزاییەکانی ئاسمان، ئەوەی لەسەر زەوی روودەدات تەماشا بکەم. هەوڵم دەدا لەبری ئەوەی کە لە قاڵبی چاوەکانی بێبەشێکدا دەربکەوم تا ئەوەی کە لەبەرچاوم دەردەکەوێت ببینم، بۆنی بکەم، دەستی لێبدەم و بزانم ئاخۆ کارێك هەیە بتوانم بۆی ئەنجام بدەم یان نا.

رووداوێکی تایبەت روانگەیەکی تایبەتی پێ بەخشیم. چاوم بە ژنێك کەوت کە کورسی لە درەختی بامبۆ دروست دەکرد. پاش ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵمدا ئەنجامدا، بۆم دەرکەوت کە رۆژی تەنیا دوو سەنتی هەیە. بڕوام نەدەکرد کەسێك بتوانێت بەم هەموو ماندوویەتییەوە کار بکات، کورسی وەها جوان دروست بکات و پارەیەکی وەها کەمی دەست بکەوێت. ئەو وتی پارەی نییە تەختەی بامبۆ بکڕێت و کورسی دوورست بکات، ناچار بووە لە کەسێکی قەرز بکات. ئەم بازرگانە وتبووی تەنیا لەبارێکدا ئەم پارەیە بە قەرز دەداتە ژنەکە کە کورسییە دروستکراوەکە تەنیا بەو بفرۆشێت، ئەویش بە نرخێك کە خۆی دیاری دەکات.

ئەمەش هۆکاری هەرزانیی کورسییەکان بوو. لە راستیدا ئەو ژنە کرێکاری چاولەدەستی ئەو بازرگانە بوو. لێم پرسی خەرجیی دەستخستنی داری بامبۆ چەنێکە، وتی نزیکەی ٢٠ سەنتە و ئەگەر تەختەی زۆر باسی بوێت ٢٥ سەنتە. لەبەر خۆمەوە وتم خەڵکی پێویستیان بە ٢٠ سەنتە و کەس یارمەتییان نادات.

قسەم لەگەڵ کرد و وتم دەتووانم ٢٠ سەنت بدەم بەو. بەڵام شتێکی تر بە خەیاڵمدا هات.

بڕیارمدا پێڕستێك لەو کەسانە ئامادە بکەم کە پێویستیان بەم بڕە پارەیە هەبوو. لەگەڵ یەکێك لە قوتابییەکانم چەند ڕۆژێك چووینە یەکێك لە گوندە نزیکەکان. دەرکەوت کە چل و دوو کەس هەمان بارودۆخی ئەو ژنەیان هەیە.

کاتێك پارەی پێویستی هەموویانم کۆ کردەوە، تووشی شۆك بووم. تەنیا ژمارەیەکی یەکسان بە ٢٧ دۆلارم دەستکەوت. شەرمم کرد لەوەی لە کۆمەڵگەیەکدام کە ناتووانێت ٢٧ دۆلار بداتە چل و دوو کەسی خۆماندووکەر و هەوڵدەر و لەهەمان کاتدا لێهاتوو. بۆ ڕزگاربوون لەم هەستەی شەرمەزاریم، ٢٧ دۆلارم لە گیرفانم دەرهێنا و دامە خوێندکارەکەم و پێم وت بیدەرە ئەو چل و دوو کەسەی کە چاومان پێیان کەوت. پێیان بڵێ ئەمە قەرزە، بەڵام تەنیا بۆ ئەو کاتەی کە توانیان قەرزەکە بدەنەوە. ئەوان دەتووانن بەرهەمەکانیان بەهەر کەس و لە هەر شوێنێك بفرۆشن کە پارەیەکی باشتر بدات.

**بۆ سەرکەوتنی ئەهریمەن تاکە شتێك کە پێویستە ئەوەیە کە مرۆڤە باشەکان دەستەوستان دانیشن.**

**ئەدمۆند بێرك**

هەژارەکان پاش دەستکەوتنی پارەکە هاتنە جۆش و من بە بینینی ئەو بەجۆش هاتنەیان لەبەر خۆمەوە وتم: (ئێستا دەبێ چی بکەم؟)

لەگەڵ بەرپرسانی ئەو شوعبەیەی بانك قسەم کرد کە لەزانکۆ بوو. داوام لە بەڕێوەبەری بانك کرد ئەو هەژارانەی کە گوندەکە بوون و من قسەم لەگەڵدا

کردبوون قەرزیان بداتێ. زۆر سەری سوڕما : (تۆ ئەقڵت لەدەستداوە. ئەمە مەحاڵە. چۆن دەتووانین قەرز بدەینە هەژاران؟ ئەوان هیچ نرخێکیان نییە).

بە پێداگری و تکا پێم وت: (لانی کەم تاقی بکەرەوە و ئەنجامەکەی ببینە. خۆ ئەمە ژمارەیەکی ئەوەندە گەورە نییە).

لە وەڵامدا وتم: (نا، ڕێساکانمان ڕێگە بەمە نادات. هەژاران ناتووانن گەواهینامە بدەن و وێڕای ئەمەش، ئەم ژمارە کەمە بەهای قەرزدانی نییە). پاشان پێشنیاری ئەوەی کرد لەگەڵ کاربەدەستانی سەرەوەی بانك لە بەنگلادش قسە بکەم.

پێشنیارەکەم جێبەجێ کرد و سەردانی گەورە بەرپرسانی بانکم رد. هەموویان بە یەك شێوە وەڵامیان دامەوە. سەرەنجام پاش ئەوەی کە چەندین رۆژ سۆراخی ئەم کارەم کرد، ئامادە بووم ببمە کەفیلیان. (من دەبمە گرەنتی ئەو قەرزانە. هەرچییەك پێویست بێت واژۆی دەکەم. پارەکە لە بانك وەردەگرم و بەو کەسانەی دەدەم کە دەیانناسم).

ئەمە دەستپێکی کارەکە بوو. ئەوان وتیان ئەو هەژارانەی قەرز وەردەگرن هەرگیز نایدەنەوە. وتم: (تاقی دەکەمەوە). سەیر لەوە دابوو کە ئەوان تا دوایین سەنت پارەکەیان دایەوە. من لەکاتێکدا کە زۆر سەرسام ببووم، سەردانی سەرۆکی بانکم کردەوە. (سەیرکە ئەوان هەموو قەرزەکەیان داوەتەوە. هیچ مەسەلەیەك لەئارادا نییە). لە وەڵامدا وتی: (نا، ئەوان تۆیان فریو داوە. بەزوویی پارەیەکی زیاترت لێ داوا دەکەن و ناتدەنەوە). من پارەیەکی زیاترم دانێ و دیسان قەرزەکانیان دایەوە. کاتێك بابەتەکەم لەگەڵ سەرۆکی بانکدا باس کرد، وتی: (لەوانەیە بتووانیت لە گوندێکدا ئەم کارە بکەیت، بەڵام ئەگەر ئەم کارە لە دوو گوند دا ئەنجام بدەیت، سەرکەوتوو نابیت). بەپەلە ئەم کارەم لە دوو گوند دا ئەنجام دا. دیسان کاریگەر بوو.

هەر بۆ ئەم مەبەستە ململانێیەك لەنێوان من و سەرۆکی بانك و هاوکارە پایەبەرزەکانی هاتە کایەوە. پێیان وتم ئەگەر ژمارەی گوندەکان بگاتە پێنج، قسەکەیان راست دەردەچێت. من ئەم کارەم لە پێنج گوند ئەنجام دا. خەڵکەکە دیسان قەرزەکەیان دایەوە. بەڵام بەرپرسانی بانك ملیان نەدا. ئەوان پێشنیاری دە گوند، پەنجا گوند و سەد گوندیان کرد. بەمجۆرە، رکابەرییەك لەنێوان من و ئەواندا روویدا. من گەیشتمە ئەنجامگیرییەك کە ئەوان نەیاندەتوانی لاری لێ بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان بەجۆرێك فێر کرابوون کە پێیان وابوو هەژاران جێگەی متمانە نین. خۆشبەختانە من بەم جۆرە پەروەردە نەکرابووم، بۆیە ئەوەی کە دەمبینی بڕوام پێ دەکرد. بەڵام ئەقڵ و چاوی بەڕێوەبەرانی بانك لەژێر کاریگەریی زانیارییەکانی پێشوویاندا کوێر بوو.

سەرەنجام لەبەر خۆمەوە وتم، بۆچی دەبێ ئەوان رازی بکەم؟ من خۆم دڵنیام لەوەی کە هەژاران دەتوانن قەرز وەربگرن و قەرزەکانیان بدەنەوە. ئەی بۆ بانکێکی جودا دروست نەکەین؟

ئەم بابەتە سەرنجی منی راکێشا، لەم رووەوە پێشنیارێکم بۆ حکومەت نووسی و داوای مۆڵەتێکی کردنەوەی بانکم کرد. دوو ساڵی خایاند تا حکومەتم رازی کرد. لە مانگی ١٠ی ١٩٨٢دا ئێمە بووین بە بانکێك- بانکێکی رەسمی و سەربەخۆ- ئێستا دەمانتوانی بەو شێوەیەی کە دەمانەوێ پلانەکانمان فراوان بکەین و هەر واشمان کرد.

بانکی گرامین لە ئێستادا لە ٥١٠٠ گوندی بەنگلادشدا چالاکە. ئەم بانکە ١٤١٧ شوعبە و زیاتر لە ١٢٠٠٠ کارمەندی هەیە. ئەم شوعبانە تاوەکو ئێستا ٤/٥ ملیارد دۆلاریان بەشێوەی قەرزی ١٢ تا ٥ دۆلارییان داوە و تێکڕای ژمارەی قەرز لەژێر ٢٠٠ دۆلارەوەیە. ئەم بانك هەموو ساڵێك نیو ملیارد دۆلار قەرز دەدات. تەنانەت

دەرۆزەکەرانیش قەرزەکە دەیانگرێتەوە تاوەکو واز لە دەرۆزە بهێنن و روو بکەنە کاری فرۆش.

٩٦٪ی کەسانی قەرزوەرگر ژنن. ئەوان بە وەرگرتنی ئەم قەرزە دەیانتووانی بڕیار بدەن ژیانی خۆیان و خێزانیان بگۆڕن.

ئەمڕۆکە زیاتر لە ٢٥٠ دامەزراوە لە ١٠٠ وڵاتی جیهاندا سیستەمەکانی قەرزی بچوك لەسەر بنەمای مۆدێلی بانکی گرامین بەکار دەهێنن.

بە پێی بۆچوونی پسپۆڕانی ئابووری، بیرۆکەکەی محەمەد یونس لەمەڕ بەخشینی قەرزی بچوك، لە سەد ساڵی دواییدا گرنگترین پلانی گەشەپێدان بووە لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا.

من بەڵێنم بەم درەخت و دارستانەدا کەتا ئەو کاتەی کە هەموو هێزی خۆم بۆ بەرگرتن لە کاولکاری نەخەمەگەڕ، پێیەکانم بەر زەوی نەکەون.

(جولیا باترفلای هیل)

## ژیاننامەی ئیلهامبەخش (٤)

لێرەدا بانگهێشتت دەکەم بۆ تاووتوێی سەربوردەی کەسێکی تری کاریگەر و گۆڕەر. جولیا باترفلای هیل، بۆ ماوەی دوو ساڵ و دوو رۆژ لە سەرەوەی درەختێك لە کالیفۆرنیا دەژیا تاوەکو ژیانی ئەو درەختە سورە شەشسەد ساڵەیە رزگار بکات.

یەکەمین جار کە جولیا درەختەکەی بینی ناوی نا (لۆنا).

ئەو کەوتە سەر ئەژنۆ و دەستیکرد بە گریان، بەڵام کۆمپانیای کاریتە کە خاوەنی ئەو زەوییە بوو، گرنگی بە هەستەکانی ئەو نەدەدا. بەرنامەی کۆمپانیاکە ئەوە کە ئەم درەختە و چەند دانەیەکی تری درەختە کۆنەکان ببڕدرێنەوە. دەبێ جولیا لە پێشدا کارێك بکات و رێگر بێت لەبڕینەوە، بۆیە لەپێناو مانەوەی ئەو درەختەدا ماڵێکی لەسەر دروستکرد. درەختە سورەکانی کەناراوی کالیفۆرنیا لەناو تەمتوماندا گەشە دەکەن. لە تەمتومانێکی تەنکدا هەناسەگۆڕکێ دەکەن و توێکڵیان لە ئەنجامی شێدا سور هەڵدەگەڕێت. ئاو و رووناکی خۆر رادەکێشن و زۆر بەرز دەبنەوە. لەبەرئەوەی ئەو زەوییەی کە تیایدا گەشە دەکەن لە ئاستی

دەریا بەرزترە، با و سەرماش لێیان دەدات. زۆرجاریش لە شەودا پلەی گەرما دەگاتە سفر.

یەکەمین زستان کە جولیا ژیانی لەژێر بای توندی ئەم درەختە گوزەراند و توندی خۆی نوساند بە لقەکانی درەختێکەوە کە چەند مەترێك بەرز بوو، زستانێکی سارد و بێ بەزەیی بوو.

چیرۆکی ئەو لەلایەن میدیا ئەهلیەکانەوە لە هەموو دنیادا بڵاو بووەوە و ئەو وەکو قارەمانێکی ژینگە ناسرا. ئەو راگەیاندن و چالاکییەکی زۆری خستەگەڕ. لە رێگەی تەلەفۆن هەتاوییەکەی خۆی لەگەڵ هەموو گروپە ژینگەییەکاندا پەیوەندی دروستکرد و لەگەڵ هەموو ئەو کۆنفرانسانەی کە لە سەرانسەری دنیا بەرێوە دەچوون پەیوەندی تەلەفۆنی هەبوو و هەفتانە سەدان نامەی پێدەگەیشت. رۆژانە هاورێ و هەوادارانی سەردانیان دەکرد و خواردنیان بۆ دەهێنا. ئەو بە تەنیا لەسەرەوەی درەختەکە بەرەنگاری دەکرد و بە مکورییەوە بەردەوام بوو.

وێنا ئەوە بکە، ژنێك ٧٤٠ رۆژ بە تەنیایی لەناو لق و پۆپی درەختێکدا بژیت. ئەو لە تاریکایی و بێدەنگیدا چی دەکرد؟ تەمەنی تەنیا بیست و پێنج ساڵ بوو، بەڵام باوەڕ بکە ئەم کارە ئەوی گەیاندە ئەقڵیەتێکی مەعنەویی چەنێك مەزن.

لە مانگی ١٢ی ١٩٩٩دا هەواڵی ئەوە گەیشت کە دواجار کۆمپانیا کاریتە بڕیاری داوە لە بڕینی درەختەی جولیا و هەروەها ئەو درەختانەش کە لە رووبەری هێکتارێکی ئەو درەختەدان پاشگەز بێتەوە.

بە راگەیاندنی ئەو بڕیارە نوێیەی کۆمپانیای کاریتە، ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو کە ئەو ئاسانگیر بێت.

(خراپترین و سوکترین بیرکردنەوە کە دەشێ لە ئەقڵی مرۆڤێکەوە سەرچاوە بگرێت ئەوەیە کە: یەك کەس چی لە دەست دێت؟)

سـەربوردەی جولیـا فێرمـان دەکـات کـە مرۆڤێکـی بـە ئیمـان و بڕوابـەخۆ، ئەوەندەی زۆرینەیـەکی گـەورە کاریگـەر و بـەهێزە. ئـەم چیرۆکە نموونەیەکـە لـە مرۆڤێك کە دەتوانێت دنیا بگۆڕێت. یەکـەمین سـەفەر بـەرەو مـانگ پـێش سـی و چەند ساڵێك بـوو و بیسـتوومە کـە هێشـتاش شـوێنپێی نـەیل ئارمسـترۆنگ لـەوێ دەبینرێ، چونکە هیچ جۆرە با، باران و بەفرێك لەسـەر مـانگ نییـە تـا شـوێنپێکە لەناو ببات.

وا بیهێنـە بـەر چـاوی خـۆت کـە رۆژێکـیش نـۆرەی ئێمـە دێـت کـە بـڕۆین. چ شوێنپێیەك بە یادگار جێ دەهێڵین؟

بیر لەوە بکەوە چۆن دەتەوێ گۆڕانکارییەك بهێنیتەکایەوە. لەوانەیە نەتوانیت گیانی درەختێکی شەشسـەد ساڵە رزگـار بکـەیت، بـەڵام رۆژانـە هـەزاران رێگـە و شـێواز هـەن تـا بتوانیـت گۆڕانکارییـەك بهێنیتـە کایـەوە و شـوێنپێیەکی خـۆت دابنێیـت و لێگـەڕێیت ئـەم شـوێنپێیانە، تـۆ نـەمر و زینـدوو رابگـرن. هاتووینەتـە دنیاوە تا بیگۆڕین.

بەخت چاك ئەو كەسەیە كە ناوی چاكی لە دنیا
جێ هێشت ئەو كەسە زیندوو مایەوە كە
خێرێكی لەم رۆژگارە لێ مایەوە
(بیدل كاشانی)

## دەمەوێ لێرەدا بەلەمەوانی بكەم

ئەو چیرۆكەی خوارەوە هی ئەندێرا گاندیی كچی جواهیر لال نەهرۆی سەرۆك وەزیرانی هیندستانە لە سەردەمی خەباتی خەڵكی هیندستان لەدژی داگیركاری ئینگلیزدا.

(لە ئوتار پرادش ناوچەیەكی شاخاوی هەیە بەناوی نایینی تال كە دەریاچەیەكی زۆر جوانی لێیە. هیچ هیندییەك مافی مەلەكردن یان لێخوڕینی بەلەمی لەم دەریاچەیەدا نەبوو. باپیرەم وتی: دەمەوێ لێرە بەلەمەوانی بكەم).

بۆ ماوەی چەند رۆژێك بەشێوەی رۆژانە پەنجا روپیەیان سزا دەدا. بڕوا بكەن كە لەو رۆژانەدا پەنجا روپیە پارەیەكی كەم نەبوو، بەڵام ئەو وتی: ئەگەر ئەم كارە ببێتە هۆی مایەپوچی منیش، هەموو رۆژێك بۆ بەلەمەوانی دێمە ئێرە تا ئەوەی كە خەڵك لەسەر ئەوە رابێن هیندییەك بەسەر ئەم دەریاچەیەوە ببینن و بڵێن بۆچی هیندییەك لێرە بەلەمەوانی نەكات.

ئەمە شتێكە بوو كە روویدا. بەدرێژایی وەرزێك، بەرنامەی باپیرەم ئەوە بوو هەموو رۆژێك كە بچێتە بەلەمەوانی غەرامەی ئەو رۆژە بدات و پۆلیسیش لە دەوروبەری دەریاچە دووری بخاتەوە. وەرزی دواتر بەناچار قبوڵیان كرد كە رێگریی هیندییەكان لە بەلەمەوانی لەسەر دەریاچە كارێكی پڕ دەردەسەرییە. ئەگەر ئەم پیاوە بیەوێت لێرە بەلەمەوانی بكات، لێیگەڕێن با بیكات و هەڵبەت ئەگەر توانی ئەم كارە بكات، خەڵكی تریش دەتوانن.

بایەك هات و هێلانەکەمانی برد هەڵسەوە
تا دووبارە دروستبکەینەوە هێلانەیەك

## تەواوبوو یان تەواوکەر؟

قەیرانــە ئابوورییــەکان، لەوانــەش مایەپوچــی و دەرکــردن لــە ئــیش، لــەو هەلومەرجانەن کە جێگیری و ئاسایشی ژیانمـان تووشـی گێروگرفـت دەکـەن. لـەم هەلومەرجەدا کارتێکراوەکان خۆیان بە تەواوبوو دەبینن، بوونەوەرێکی بڕستلێبڕاو کە بەندی هەلومەرجی بێ بەزەیی و نادادپەروەرانـەی ژیانـە. بـەڵام کاریگـەرەکان تەواوکـەرە بـەرەنگارەکانن. فەلسـەفەی ئـەوان، ئەمەیـە کـە لـە ماراسـۆنی ژیانـدا ئەوانن کـە شـوێنی هێڵـی کۆتـایی دیـاری دەکـەن و مـرۆڤ تـا مـل نـەدات شکسـتی نەهێناوە.

> **کاتێك دەکەویتـە سـەر زەوی، زۆر لەسـەر زەوی رامەکشـێ، لەبری ئەوە مشتەکۆڵەیەك لە زەوی بدە و هەڵسەوە**
>
> **(پێت میشێل)**

کاریگەرەکان هەرگیز رێگە نادەن قەیرانەکان و هەلومەرجە تۆقێنەرەکان ئـەوان دەستەوەسـتان بکـەن. تەواوکـەرەکان بـە پشـت بەسـتن بـە هێـزە ناوەکییـەکان و هـەروەها لێهاتووییـە ئـەزموونی و شـارەزایەتییەکانی خۆیـان نـەك تـەنیا لـەدوای کەوتنە سـەر زەوی هەڵدەستنەوە، بـەڵکو بـە گەڕانەوەیـەکی پرشـانازی دەگەنـە جێگەیەکی زۆر سەرووتر و نموونەییتر لە پێشوو.

له کتێبی (ئێمه دەرکراین و ئەمە باشتری ڕووداوی ژیانمان بوو) کە (بەرهەمی هاروی مەك کی)یە ئاماژە بە ژمارەیەکی زۆری سەربوردە و هەوراز و نشێوییەکانی ژیانی ئەو تەواوکەرانە دەکرێت کە توانیوویانە پاش ئەزموونی دەرکران لە ئیش، بە دۆزینەوەی ڕۆحیەت و بڕوابەخۆبوونی خۆیان دەستیان بە ئیش کردووەتەوە و سەرکەوتن و کارامەیی شکۆمەندانەیان دوور لە چاوەڕوانی بەدەست هێناوەتەوە.

ئێستا بە کورتی ئاماژە بە سەربوردەیەکی تر دەکەین و بانگهێشتتان دەکەین بۆ درێژەدان بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە.

## درامای تۆپی گۆڵف

تۆپەکانی گۆڵفی سەرەتا ئاستێکی تەواو لوسیان هەبوو و پاش ماوەیەك کە ڕووەکەیان لوسییەکەی نەدەما، بێ کەڵك دەبوو. یاریزانێکی مایەپوچی گۆڵف ئەم تۆپانەی لە گۆڕەپانی یارییەکەدا کۆ دەکردەوە و ڕاهێنانی لەسەر دەکردن و پاش ماوەیەك دەیتوانی هاوڕێ براوەکانی هەر بەو تۆپە ناتەواو و تێکچووانە بەزێنێت.

تۆپەکانی گۆڵفی ئەمڕۆ ٤٣٢ چاڵ و چۆڵی بچوك لەسەر ڕووەکەیان هەیە کە خێرایی و وردکارییان بەرانبەر لێخشاندنی هەوا بەرز دەکاتەوە. نالەبارییەکانی ژیانیش وەکو تۆپی گۆڵف دەبێتە هۆی زیادبوونی تواناکانی مرۆڤ.

**بەربوونەوە سەر زەوی کەسێکی تێکشکاوت لێ دروست ناکات، بەڵام هەڵنەسانەوە دەتکاتە کەسێکی وەها.**

پەند وەرگرە لە بەڵای ئەوانیتر
تا نەبیتە مایەی پەندی ئەوانیتر
(سەعدی)

# ژیاننامەی ئیلهامبەخش(٥)
# بەسەرهاتی مارك ڤیکتۆر هانسن

(ڤیکتۆر هانسن)یش زۆر کەسی ناسراوی تری پڕئەزموون، رەتکردنەوە و مایەپوچی زۆری بڕیووە. ئەو پاش ئەزموونی دەرکردنێك، دەستیکرد بە خستنەگەڕی کۆمپانیایەکی خانووبەرە و لەماوەیەکی کورتدا کۆمپانیایەکی بچوکی ئەو نزیکەی ٢ ملیۆن دۆلار فرۆشی هەبوو. بەلام سەردەمی خۆشی مارك تەنیا تاوەکو ساڵی ١٩٧٤ و ئەو کاتە بەردەوام بوو کە وەستاندنی هەناردەی نەوت لەلایەن ئەندامانی ئۆپێك و وڵاتانی عەرەبی راگەیەنرا. سەردەمی ئاوابوونی مارك و کۆمپانیاکەی دەستپێکرد و بەخێرایی کەوتبووە نشێوی هەرەسەوە.

مارك ناچار بوو لە گۆشەی ماڵی یەکێك لە دۆستانی، ٦ مانگ بەسەر ببات و لەو ماوەیەدا نەیتووانی ٣٠٠ دۆلار دابین بکات بۆ گرتنی پارێزەرێك بۆ راگەیاندنی مایەپوچیەکەی و بتووانێت لە بەرانبەر قەرزارەکانی پارێزراو بێت. ئەو لە زمانی خۆیەوە دەڵێت:

(ناچار بووم تا سەردانی کتێبخانەی شار بکەم و کتێبێك بدۆزمەوە تا قۆناغە یاساییەکانی راگەیاندنی مایەپوچیم فێر بکات).

بەڵام چ شتێك دووبارە هیوای مارکی زیندوو کردەوە؟ کاسێتێکی وتاردانی دەروونیی (مارت رۆبەرتن)ی پێ گەیشت کە چارەنوسی مارکی گۆڕی.

مارك دەڵێت: (من ٢٨٧ جار گوێم لەم كاسێتە گرت و بۆم دەركەوت كە هۆكاری مایەپوچیم تەنیا خودی خۆمم). ژیان هەر بەردەوام بوو و مارك تـوانی پارەیـەكی كەم كۆ بكاتەوە و قەرزەكانی بداتەوە و دواتر بڕیاریدا وەكـو وتاربێـژ و نووسـەری كتێبەكان لەبارەی سەركەوتن، بكەوێتە چالاكی. ئەو چەندین كتێبی بەناوی خـۆی نووسـی و پاشـان لەگـەڵ یـەكێك لـە هاوڕێكـانی بـەناوی (جـاك كانفیڵـد) بڕیاریـدا كتێبێكی جیاواز بنووسێت. كتێبێك كە بتوانێت بچێتە ناو ڕۆحی مرۆڤەكانەوە.

بەڵام پاش سێ ساڵ هەوڵدانی شەو و ڕۆژ چ شتێك بوو بە دەسـتكەوتی مـارك و جاك؟ چاپ نەبوونی كتێبەكەیان لەلایەن ٣٣ دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی جیاواز كە بووەهـۆی ئـەوەی بەڕێوەبـەری بەرنامـەكانیان بگاتـە ئـەو ئەنجامـەی كـە ئـەم جۆرە كتێبانە بـە تـۆنێكی حەماسـی و سـۆزیی تونـدەوە نافرۆشـرێن. دەركردنـی ژمـارە ٣: بەڕێوەبـەری بەرنامـەكانی مـارك و جـاك ئـەوانی دەركـرد. بـەڵام ئـەوان دیسان هەوڵەكانیان بۆ ڕاكێشانی دەزگایەك كە ئامادە بێت كتێبەكەیان چاپ بكات درێژە پێدا و لە پێشانگەی ساڵانەدا كتێبەكە ١٣٤ ڕەفزی تری وەرگرت.

هەموو دەزگاكانی بڵاوكردنەوە لە نیویۆرك ئەوانی ڕەفز كردەوە تا لە كۆتاییدا دەزگایەكی بچوك لە فلۆریدا ئامادەیی خۆی پیشاندا بـۆ چـاپكردنی كتێبەكـەیان. مارك ئەو ڕووداوانە بەمجۆرە بیر دەخاتەوە: (كەسێك كە بازارڕدۆزیی كتێبەكەی لـە ئەستۆ بـوو پەیوەنـدی پێـوە كـردین و وتـی دەزگایـەكی بـڵاو كردنـەوە ئامادەیە كتێبەكـەتان چـاپ بكـات و ئەگـەرێكی زۆریـش هەیـە كتێبەكـە بفرۆشـرێت بـەڵام دەبووایە تۆ ٢٠ هەزار بەرگی سەرەتایی خۆتان لە دەزگاكە بكڕن، هەر یەكەشـیان بـە نرخـی ٦ دۆلار. مـن لەبـەر خۆمـەوە وتم تاكـە شـتێك كـە ئێمـە لـە ئێسـتادا پێویستمانە ئەوەیە كە لە شوێنێكەوە دەسـت پێبكـەین و ئێمـە كـە باوەڕمـان بـە سەركەوتنەكانمان هەیە كاتمان لەدەست نەدا و وەڵامی ئیجابیمان دایەوە ئەوان).

پاشماوەی بەسەرهاتەکە شیرینە. مارك و جاك تاوەکو سەرەتای ساڵی ١٩٩٨ بیست و هەشت ملیۆن دانەیان لە کتێبەکانیان فرۆشت. تاوەکو سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٤ی زایین، مارك مەزەندەی ئەوەی کردبوو کە ئەوان زیاتر لە سەد ملیۆن دانەی کتێبە جیاجیاکانیان فرۆشتبوو، واتە زیاتر لە یەك ملیارد دۆلار قازانجی بێگەرد. ئەوان بەشێوەیەکی تێکڕایی ١٥ ملیۆن دانە کتێبیان لە ساڵێکدا فرۆشت.

بە مەزەندەی مارك، لە ئێستادا کۆمەڵە کتێبەکەی ئەوان پڕفرۆشترین کتێبە لە دنیادا. هەروەها مارك لە بڕوای وایە ئەوان تاوەکو ساڵی ٢٠٢٠ نزیکەی یەك ملیارد دانە لە کتێبەکانیان لە سەرانسەری جیهاندا بفرۆشن.

**گرنگ نییە چ کەسانێك کارەکە دەست پێدەکەن، گرنگ ئەوەیە کە چ کەسانێك کارەکە تەواو دەکەن. تەواوی جیاوازییەکە لەنێوان مرۆڤەکاندا لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە هەندێ کەس کارەکە تەواو دەکەن و هەندێکی تر پێیان وایە کارەکەیان تەواو بووە.**

**(رێد ئۆرباخ)**

مارك بڕوای وایە کە لە پشت هەر سەرکەوتنێکەوە، تیمێك هەیە ئێمە نایبینین بەڵام لە ڕاستیدا هەموو کارەکان بەدەستی ئەوان ئەنجام دەدرێت و ئەوە هێزی تیمە کە دەتوانێت مەحاڵەکان بکاتە ئاسان.

کاتێك کە من مایەپوچ بووم، هاوڕێکانم بزر بوون و بەمانای وشە پێویستم بە نانی شەو بوو چ جای ئەوەی کە بتوانم تیمێکم لە خزمەتدا بێت. پاشان بڕیارمدا تیمێکی گریمانەیی پێکبێنم کە ئەندامەکانی (والت دیزنی)، (جۆن ئێف کەنەدی)، (ئەندرو کارنگی)، (مارك توەین) و (ئەبراهام لینکۆڵن) بوون.

پێکهێنانی تیمێکی وەها بۆ من خەرجییەکی نەبوو و من هەموو رۆژێك نزیکەی سەعاتێك لە کاتەکەم بە قسەکردن، دیدار و نووسینی ئەم کەسە گەورانە بەسەر دەبرد و هەوڵم دەدا وێنای ئەوە بکەم ئەگەر ئەوان لە هەلومەرجی مندا بوونایە چ بڕیارێکیان دەدا. من لە خەیاڵی خۆمدا پرسیاری ئەوەم لێ دەکردن چ پێشنیارێکیان بۆ من هەیە تا بتوانم جارێکی تر لەسەر پێیەکانم بوەستم؟

عەشق واتە رۆح جوانکردن
زۆر کـــەوتن و هەڵسانەوە
(موجتەبا کاشانی)

# ئامۆژگارییەکانی مارك ڤیکتۆر هانسن(١)

هەر کاتێك کە من لە شوێنێکدا وتار دەدەم، ئەو پرسیارە دەکەم ئاخۆ چەند کەس لە ئێوە تاوەکو ئێستا لەلایەن هەر کەس بە هەر هۆیەك بێت وەڵامی رەفزت بیستووە؟ ئینجا بە خێرایی هەموو دەستەکان بەرز دەبنەوە.

پاشان لێیان دەپرسم چ کەسێك حەز دەکات وشەیەکی پێنج پیتی پێ بڵێم کە بتوانێ بەهۆیەوە بەسەر هەموو هەوڵەکانیدا زاڵ بێت؟ و دووبارە هەموو دەستەکان بەرز دەبنەوە.

پاشان پێیان دەڵێم ئەو وشەیە، وشەی (دواتر)ە. هەر کاتێك کەسێك پێی وتی (نا)، کاتی ئەوەیە تۆ بڵێیت (دواتر)و بزانە ئەوە خۆتیت کە بڕیار دەدەیت چۆن چۆنی مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، پاشان وەرن وەکو مناڵ رووبەرووی (نا) و وەڵامی رەفز ببینەوە کە دوو خولەك دواتر هەموو شتێکیان بیر چووەتەوە و پاشان لە سەرەتاوە دەستیان پێکردووەتەوە.

هەر کاتێك سەختییەك ڕووبەڕووت بووەوە
گـــەر ئاســـان بیگریـت زوو تــەواو بووە
(ناسر خەسرەو)

# ئامۆژگاریی مارك ڤیکتۆر هانسن(۲)

ئێمــەی مــرۆڤ بــەزۆری بەدرێـژایی ژیانمــان درەنــگ یــان زوو دەکەوینــە بــەر تەحەدییەکی گەورەوە. هەڵبژاردنی قبوڵکردنی خەتـەر و یـان جوڵـە لـە پـەراوێزی ئاسایشدا.

ئەگەر دووەمیان هەڵبژێریت هەردووکیان لەدەست دەدەیت، کاتی ئەوە هـاتووە کە پیێ بە پیێ ڕۆیشـتن بـە ڕێگـەدا فـەرامۆش بکـەیت و بـەرەو دەرفەتـەکانی ژیـان رابکەیت.

**ئەگەر دەرفەتەکانی ژیان بکەیتە قوربانی ئاسایش و سەلامەتی، هەردووکیان لەدەست دەدەیت.**

دەبووایە ئێمە بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك ڕێگاکانی گەیشتن پێی و کێشەکانی سەر ڕێگا بدۆزینەوە، بۆ نموونە ئەگەر لێمان بپرسن لە ماوەی دە سـاڵی ئاینـدەدا هەر دەرفەتێك بێتە پێشتان چی دەکەن؟ وەڵامی ئەم پرسـیارە ئامـانجی کۆتـایی تۆیە و دەبووایە بۆ گەیشتن پێی پلان دابنێیـت، ئـەو کێشـە و کۆسپانەی لەسـەر ڕێگاکەت دەیبینیت یادداشـت بکـەیت، تەنانـەت ئەگـەر سـاتێکتان لـە شـەو و ڕۆژ بێتەوە یاد و ئەگەر ڕۆژێك لە ئیشەکەتان دەرکـران لـە سـفرەوە دەسـت پێبکـەن،

رابردوو و ئەمەی کە بۆچی فلان کەس منی دەرکرد و دەبێ تۆڵەی لێبکەمەوە، فەرامۆش بکەن.

- وزەتان بۆ رابردوو بەفیڕۆ مەدەن، تەنانەت چیتر بیری لێمەکەوە. تۆ وەکو پەڕەیەکی سپیت کە دەبووایە ئایندەیەکی تازەی لەسەر بنووسیت. ئەو کاتەیە کە تۆ دەتوانیت کات لە بەرژەوەندیی خۆت کەم بکەیتەوە و کارێك کە لەوانەبوو ١٠ ساڵت بوێ بۆ ئەنجامدانی، لە ماوەیەکی زەمەنیی کورتتردا ئەنجامی بدە.

بابەتی گرنگی تر ئەوەیە کە ئێمە نەهێڵین تەنیا بە هەبوونی ئاسایشی پیشەیی چاومان بەرانبەر ئایندە دابخرێت و پاڵنەرەکانمان بۆ بەرەوپێشچوون لەناو بچێت.

دەبووایە بەردەوام ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین کە چ شارەزایەتییەك یان کام شارەزایەتییانە دەبنەهۆی ئەوەی کە داهاتی زیاتر بەدەست بێنین و لەکارەکانماندا سەرکەوتوو بین. کەوایە بەدوای فێربوونی شارەزایەتییەکاندا وێڵ بین و هەوڵ بدەین خۆمان لەگەڵ پێداویستییەکانی رۆژگاردا هەماهەنگ بکەین.

ئەو مرۆڤانەی کە بایەخ و سەرنج نادەنە ئەوانیتر (سەرنجی سۆزخوازانە) زیاتر سەرنجی ئەوانیتر بەلای خۆیاندا رادە کێشن.
ئەو مرۆڤانەی کە بەدوای خۆدەرخستن دا وێڵ نین زیاتر دەبینرێن.
ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی گوێ لێگیران ناکەن زیاتر دەبیسترێن.
ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی ستایشی ئەوانیتر ناکەن زیاتر ستایش دە کرێن.
ئەو مرۆڤانەی کە سۆراخی کەوتنەژێر کاریگەری ناکەن، زیاتر دەبنە جێی رەزامەندی و کاریگەر دەبن.



# بۆئەوەی بیگۆڕین هاتووینەتە ئەم دنیا

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٥٠٠٠) دینار